زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان

ئەڵقەی دوازدەهەم

# سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی

# چەندژنی

# لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا

عەلی باپیر





## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین .
- ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی وسازێنەری ڕابوونی ئیسلامین .
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کوردە بەم سەرچاوانە ، ئازادکردنیەتی لە گشت کۆت وبەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتی وتاکرەوی و ڕەوتگەرایی .
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد ، تاتوانای ئەنجامدانی ئەوگۆڕانکاریانە هەبێ ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە .

دەگەڵ ڕێزو تەقدیرمان بۆ بیرو ڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە ، مەرجیش نییە ئێمە پابەندی هەمو بیرو بۆچونەکانیان بین .

بادەستورێشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت :

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

نـــاوی کتێـــــب: ســروشــت و پایەکـانی خێزان و مەســەلەی چــەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵ دا
نـوســـــــــەر: عـەلــی باپیــر
بـــــلاوکردنەوەی: نوسـینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوە و ڕاگەیاندن/ هەولێر
خـــــــــــە ت: نــەوزاد کــۆیی
نەخشەشازی ناوەوە: عزالدیــن محــمـد عـمـر
بــــــــــەرگ : أمیــن مخـلص
نۆرە و سـاڵی چـاپ: یەکـــەم ١٤٣٠ك – ٢٠٠٩ز
تـــــــــــیراژ: ١٥٠٠ دانــە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشـتی کتێبـخانەکان ژمارەی سـپاردنی (        )ی ساڵی ٢٠٠٩ ی دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

چاپکردنی پێشووی کتێبەکانم بەنیسبەت گەورەیی

توانا و هەل و مەرجی ئەو ڕۆژگارە بوو.

وە ئێستێ بە هیوام وابوو شێوە چاپکردنێکی

وایان بۆ بڕەخسێ کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەرانیان بێ. جا ئێستا سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم لە خۆ و سینگەی تەفسیر بەو کارە هەڵکەستی.

خوا بەرەکەتی بخاتە ئیش و کاریانەوە و لەگەڵیان

بێت، منیش سوپاسیان دەکەم.

عەلی باپیر

# نێـــوەڕۆك

سروشـتیان دا دیاریکراون.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٖ وَلَا مُؤۡمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ
أَمۡرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡۗ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلٗا مُّبِينٗا ٣٦﴾ الأحزاب



# پێشکەش بێ

بەو مسوڵمانانەی کە لەسایەی ئیمانی پتەویان بە پەروەردگاریێتی خوا عزوجلو پێغەمبەریێتی موحەممەد ﷺو بەرنامەیێتی ئیسلامەوە، بڕواو قەناعەتیان بەرانبەر بەڕاستیێتی سەرجەم یاساکانی شەریعەت لە هەموو بوارەکانی ژیاندا هێندە پتەوو دامەزراوە، بەپشوە بای هیچ بانگەشەو تۆمەتێکی ناحەزانە، نەك هەر نالەقێ بگرە مووشی لێنالەخشێ.

# ئـەم نامیلکـــەیە

خوێنــــەری بەڕێز!
ئەم نامیلکەیە لە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتوە:

بەشی یەکەم: بناغەی عەقیـدەیی‌و فیکریـی سروشـتی خێـزان‌و پایـەکانی لـە ئیسلامدا
بەشی دووەم: مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع‌و عەقڵدا.

شایانی باسیشە کە هەردوو بەشەکە کاتی خۆی بە (١٤) ئاڵقـە لـە ڕۆژنامـەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکرانەوە[١] لەکاتێکدا کە باس‌و خواسی (یاسـای بـاری کەسـێتی) بەگشتی‌و بەتایبەت مەسەلەی (چەندژنیی) مشت‌ومڕی زۆریـان لـەبارەوە دەکـراو، لەلایەن نەیارانی ئیسلام‌و شەریعەتەکەیەوە قسەوقاڵی زۆر بێ بنەماو نازانستییانە دەپرژێنران، بۆیە بە ئەرکی خۆمم زانی کـە بـۆ بەرپەرچـدانەوەو پووچـەڵکردنەوەی زۆرێك لە قسەوباس‌و تۆمەتانە، ئەم زنجیرە باسە بنووسم، کـە دڵنیـام هەرکەسـێك بەوردیی‌و تێگەیشتنەوە ئەم زنجیرە باسەی خوێندبێتەوە یان بیخوێنێتەوە، خاترجەم دەبێ کە ئیسلام لەبواری (بـاری کەسـێتی) بەگـشتی‌و مەسـەلەی (چـەندژنیی)دا بەتایبەت، وەك هەربوارو مەسەلەیەکی دیکە، لەسەدا سەد هەق‌و ڕاستی پێکاوەو، زۆر بەشێوەیەکی مەنتیقیانەو هاوسەنگانەو وردبینانە مامەڵەی کردوەو، هەرجۆرە بەدیلێکی دیکەی یاساو بڕیارەکانی شەریعەت جگە لەپەیداکردنی گرفت‌و کێـشەو

١) ژمارەی () تاکو ژمارە ()، زۆریش سوپاسی سەرنووسەرو ستافی ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە) دەکەم، کە زۆر بەرێك‌و پێکی‌و بێدەستکاریی سەرجەم ئاڵقەکانی ئەم زنجیرە باسەیان بێ پسانەوە بڵاوکردنەوە.

نەخۆشیو سەرئێشە، هیچ بەرهەمێكی دیكەی نابێ، دیارە شتێكی ڕوونیشە كە ڕازی نەبوون بەهەریاساو بڕیارێكی ڕوونو بێ چەندو چوونی خوا سبحانە وتعالی مایەی لەبازنەی ئیمانو ئیسلام دەرچوونو كافربوونە، وەك خوا عزوجل فەرموویەتی:

﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعۡنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٞ مِّنۡهُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٧﴾ النور ﴾، واتە: وەدەڵێن بڕوامان بەخواو بە پێغەمبەر هێناو فەرمانبەرین، كەچی دوای ئەوە دەستەیەكیان لاملیی دەكەن، وەئەوانە بڕوادارنین!

ئیدی بەهیوای ئەوە كە بەهەوڵو هیممەتی هەموو ئەوانەی كە بڕیارمان داوە مسوڵمان بینو بەمسوڵمانەتی بژینو بەئیمانەوە بمرین، كارێك بكەین كە بەرنامەو شەریعەتی خوای كاربەجێ بكەینە كاڵای باڵامانو ژینمان بەپێی دینمان ڕێك بخەین، تاكو بەختەوەریی ئێرەو سەرفرازیی ئەولا بۆ خۆمان مسۆگەر بكەین.

٢٥/ صفر / ١٤٣٠

٢١ / ٢ / ٢٠٠٩

هەولێر

# پێشەكی

الحمدلله رب العالمين وصلّى الله تعالى وسلّم وبارك على النبيّ محمد المبعوث رحمة للعالمين وآله المهتدين بهديه المبين.

سەرەتا بەتەما نەبووم، كە بەشداریی ئەو مشتو مڕو شەڕە قسەیە بكەم، كە لەچەند ڕۆژی ڕابردوودا لەپەرلەمانی كوردستاندا لەسەر یاسای باری كەسێتی كرا، بەڵام دوای ئەوەی هەندێك نووسینم بینین كە وێڕای سەفسەطەو چەواشەكاریی، سنوورشكێنی زۆریشیان بەرانبەر بەقورئانو سوننەت تێدابوو، هەرچەندە مەگەر بەدەگمەن دەنا خاوەنەكانیشیان خۆیان پێ مسوڵمانە! خۆمم ناچار بینی كە چەند قسەیەك لەبارەی سروشتو پایەكانی خێزان بەگشتیو مەسەلەی چەندژنیی (تعدُّد الزوجات)یەوە، بەتایبەت بكەم، هەم بۆ بەرچاو ڕوونیی خەڵكو جەماوەری مسوڵمانی كوردستان بەگشتیو، هەم بۆ خستنەڕووی پووچەڵیی هەندێك لەو قسەو نووسینانەو، هەم بۆ زیاتر دڵنیاییو پشت ئەستووریی خوشكو برایانی ئیسلامیی لەڕاستییو تەواویی بەرنامەو شەریعەتی خوا سبحانە وتعالی، لەو بوارەدا وەك هەربوارێكی دیكە.

شایانی باسیشە كە من سەرجەم بابەتەكەم كردۆتە دوو بەش، كە لە یەكەمیاندا بەگشتی باسی بناغەی عەقیدەییو فیكریی خێزانو سروشتو پایەكانی دەكەینو، لە هی دووەمیشیاندا باسی مەسەلەی (چەندژنیی) دەكەین، دیارە بۆیەش بەپێویستم زانی بەرلەوەی دەست بەتوێژینەوەی مەسەلەی (چەندژنیی) بكەین، كە قسەكردن لەبارەیەوە لەنێو پەرلەمانداو لەدەرەوەی پەرلەمانیشو ئێستاشی لەگەڵ بێ، زۆربەی پانتایی باسو خواسو مشتو مڕەكانی گرتبۆوە، چاوێك بەبناغەی فیكرییو عەقیدەیی خێزانو سروشتو پایەكانیدا بگێڕین، چونكە: وەك

دەردەكەوێ ڕەخنەگران لە مەسەلەی (چەندژنیی) تەنیا ڕەخنەو گلەییو گازندەیان —ئەگەر بوێرن بیلێنو دووانەیتییو دووڕوویی بەكارنەهێنن- لەو یاساو بڕیارە شەرعییەی ئیسلام نیە، بەڵكو ڕەخنەو گلەییان لە گەلێك شتی دیكەش هەیە، وەك:

تەڵاق بەدەستی پیاو بوون، میرات (كە بۆچی ئافرەت نیوەی پیاو دەگرێ؟)[١]، شایەدیی دان (كە بۆچی بەدوو ئافرەت بەرانبەری پیاوێكن؟)[٢]، سەرپەرشتیارێتی پیاو بۆ ژن (قوامة الرجل على المرأة)، بەرگو پۆشاكی ئافرەت (كە بۆچی دەبێ ئافرەت جگە لە دەمو چاوو هەردووك دەستی هەتا مەچەكی عەوڕەت بێو پێویست بێ دابپۆشرێ؟)، بگرە تەنانەت پێویست بوونی بژێوو مەسرەفی ژنوماڵیش لەسەر پیاو، لەلایەن هەندێك لەو جۆرەكەسانەوە كراوەتە مایەی ڕەخنەو گلەیی، بەبیانووی ئەوە كە ئەو مەسەلەیە ئافرەت لەیەكسان بوون لەگەڵ پیاودا دوور دەخاتەوە!

جا دیارە ئێمە نامانەوێ لەم لێكۆڵینەوەیەماندا وەڵامو بەرپەرچی هەموو ئەو گومانو تۆمەتانە بدەینەوە، كە هەندێك جار بەڕاشكاوییو هەندێك جاریش بە منگە منگو لەژێر لێوەوە دەگوترێن، چونكە كاتی خۆی لەكتێبی: (ئافرەتو خێزان لەسایەی شەریعەتدا)دا وەڵامو بەرپەرچی ئەو گومانو تۆمەتانەو هی دیكەشمان داوەتەوە،[٣] بەڵكو ئەوەی دەمانەوێ لەم لێكۆڵینەوەیەماندا بیكەین ئەوەیە كە:

لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتو عەقڵو زانستدا باسی سروشتو پایەكانی خێزان بكەینو، دەری بخەین كە شەریعەتی بێ هەڵەو پەڵەی خوا سبحانه وتعالى چۆن چۆنی فەرمانی كردوەو بڕیاری داوە، كە خێزان بنیات بنرێو ژنو مێرد

---

١) هەرچەندە ئەمە بە ڕەهایی وانیەو جاری وا هەیە ئافرەتو پیاو یەكسانن و بگرە جاری وا هەیە ئافرەت زیاتریش دەگرێ.

٢) ئەمەش بەڕەهایی وانیە.

٣) بڕوانە: بەشی سێیەم: ڕەواندنەوەی تەمی تۆمەتەكانی نەیارانی شەریعەت لەبارەی ئافرەتەوە، لاپەڕە: ١٦٣ تاكو ٣٠٣، چاپی دووەم/ ٢٠٠٥ز.

پێکەوە ڕەفتار بکەن! چونکە من دڵنیام زۆرێك لە بەدبینیی و گرێ دەروونییەکانی گەلێك لە ڕەخنە لێگرانی شەریعەتو ناحەزانی، سەرچاوەکەی ڕەفتارو هەڵسوکەوتی هەڵەو ناشەرعییانەی ژمارەیەك لە مسوڵمانانە -بە ژنو پیاوەوە- لەبواری خێزانو ژنو مێردایەتیداو، ئەو پەندە کوردییەیان بەسەردا چەسپیوە کە دەڵێ: (زاری بەشیر سووتابوو فووی لە دۆ دەکرد!).

بۆیە پێویستە سەرەتا ئەو جۆرە کەسانەو هەموو لایەکیش سروشتو بناغەو پایەکانی خێزان (الاسرة)یان بەو شێوەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ باسیان کردوەو دیارییان کردوە -دوور لە هەڵسوکەوتو ڕەفتاری هەڵەو ناتەواوی هەندێك لە مسوڵمانان یان زۆربەیان- بکەوێتە بەرچاو تاکو بابەتەکەیان بەگشتی لێ دیاربێ، پاشان ئەو مەسەلەیەی کە لێیان بۆتە گرێ کوێرە بتوێژرێتەوەو بۆیان بکرێتەوە.

بەڵێ بەڕاستی بۆ چاك تێگەیشتنی هەر یاساو بڕیارێکی هەر بەرنامەو سیستەمێك، پێویستە سەرەتا سەرەنجی تێکڕای ئەو بەرنامەو سیستەم (منظومة)و دەستوورە بدرێ کە لێیەوە هەڵقوڵێوە.

ئەگەرنا لێڕوانینو هەڵسەنگاندنی یاساکانی بەرنامەو دەستوورو سیستەمێك بەپچڕاویی و دابڕاویی لەو ئەسڵو چاوگەوە کە لێیەوە هاتوون، یان بە پاشخانی عەقیدەو ئیدۆلۆژییەکی دیکەوە، مرۆڤ تووشی ئەنجامگیریی و حوکمی هەڵەو سەیرو سەمەرە دەکات!

ئایا بابایەك کە دێنێ دینگەو پایەیەك بەتەنیاو بەدابڕاویی لەو کۆشكو بینایەی کە بەشێكو پێکهێنەرێکیەتی، دەکاتە جێی سەرنجو تێوە ڕامانی و دەیەوێ حیکمەتو فەلسەفەی لەو شوێنەدانرانی دەرك بکات، بێجگە لەسەر گێژبوونو سەرسامیی هیچی دیکەی دەستگیر دەبێ؟ بێگومان نەخێر، بەڵام دیارە ئەگەر بێتو ئاسۆی ڕامانی فراوانتر بکاتو تێکڕای بینایەکە تەماشا بکات، ئەو کاتە زۆر بەسێنایی دەزانێ کە حیکمەتو سوودی ئەو دینگەو پایەیە چییەو بۆچی

لەوێ دانراوە.

هەروەها کەسێك کە لەپشت پەردەیەکی ڕەشەوە سەرنجی بەفر دەدات، بێگومان بەفری سپی ئەگەر بەڕەشیش نەبینێ بەڕەنگێکی تلْخو بۆر دێتە بەرچاوی، کە دیارە سووچ سووچی پەردەکەی بەرچاویەتی نەك خودی بەفرەکە.

کـەواتــە:

هەرکەسێك بیــەوێ وەك خۆیــان لــە یاســاو بڕیارەکــانی شــەریعەت تێبگــات، پێویستە:

١- لە سەرچاوەی ڕوونو بێ چەندو چوونی خۆیانەوە کە قورئانو ســوننەتن، بۆیــان بڕوانێو ئیسلامو مسوڵمانان تێکەڵ نەکاتو هەڵەو پەڵــەو لادانــی بەشــێك لــە شوێنکەوتووانی شەریعەت، لەسەر شەریعەت حیساب نەکات.

٢- لەبــەر ڕۆشــنایی عەقیــدەی ئیــسلامیی‌و ئامانجــە دنیــاییو دوا ڕۆژییــەکانی شەریعەت (مقاصد الـشريعة الدنيويـة والأخرويـة)دا ســەرنجیان بـدات، بـا بـۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست نموونەیەك بێنینەوە:

یەکێك لە حوکمو بڕیارە ڕوونو ئاشکراو زانراوەکــانی شــەریعەت ئەوەیــە، کـە پێویستە ئافرەتانی مسوڵمان لەبەرانبەر پیــاوانی نامــەحرەمدا هــەموو جەســتەیان داپۆشن، جگە لەدەمو چاوو هــەردووك دەســتیان تــاکو مەچــەکیان وەك لەئایــەتی ژمارە (٣١)ی سورەتی (النور)دا هاتوە، دەجــا ئــەو حــوکمو بڕیــارەی شــەریعەت ئەگەر بێتو لەسەر بناغەی لیبرالیزمو سیکۆلاریزم بۆی بڕوانــێ، ســەیرو نــەگونجاو دێتە بەرچــاو، چــونکە مــادام مرۆڤــ -لەڕوانگــەی لیبرالیــزمو ســیکۆلاریزمەوە- بەڕەهایی ئازادەو خاوەنی جەســتەی خۆیــەتی، نابــێ هــیچ کۆســپو لەمپــەرێکی لەبەردەمدا دابنرێ کە بەئارەزووی خۆی تەصەڕڕوف لە جەستەی خۆیدا بکات!

بەڵام ئەگەر لەسەر بناغەی ئیــسلامو لەبــەر ڕۆشــنایی عەقیــدەی ئیــسلامییو

ئامانجە بەرزەكانی شەریعەتدا بۆ یاسای ناوبراو بڕوانی، بەشتێكی زۆر بەجێو مەنتیقیت دێتە بەرچاو، چونكە:

١- ئیسلام دەڵێ بەڵێ مرۆڤ ئازادەو خوا عزّوجلّ ناچاری نەكردوە بڕوابێنێ، بەڵكو سەرپشكی كردوە كە بەویستو خواستی ئازادانەی خۆی بڕوا (إیمان)، یان كوفر هەڵبژێرێ: ﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ... ﴿٢٩﴾ الكهف﴾، بەڵام پاش ئەوەی بەویستی ئازادانەی خۆی ئیمان دێنێو بڕیار دەدات بەندایەتی بۆ خوا بكاتو پابەندی بەرنامەو یاساكانی بێ، نابێ لەبەرانبەر پابەندیی بەشەریعەتی خوادا خۆی پێ ئازاد بێ، بەڵكو پێویستە -بە حوكمی ئیمانەكەی- خۆی بە شەریعەتەوە پابەند بكات، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٖ وَلَا مُؤۡمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمۡرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡۗ ... ﴿٣٦﴾ الأحزاب﴾.

٢- وە لە سۆنگەی ئەوەوە كە یەكێك لەئامانجە بەرزەكانی شەریعەت ئەوەیە كە كۆمەڵگای مسوڵمان كۆمەڵگایەكی پاكو خاوێنو ساغو سەلامەتو هێمن بێ، نابێ بەرگو پۆشاكی مسوڵمانان بە نێرو مێوە -بەڵام بەتایبەت ئافرەت كە بەجوانیی خۆ دەرخستنی ڕۆڵێكی كاریگەری سەلبی لەسەر ورووژاندنی پیاوان دەگێڕێ- بەشێوەیەك بێ كە غەریزەكانی تێدا بورووژێنرێن، چونكە ئەمە پێچەوانەو دژی پاكو خاوێنو ساغو سەلامەتو هێمن ڕاگرتنی كۆمەڵگایە.

كورتەی مەبەست:

هەركەسێك بیەوێ یاساو بڕیارێكی شەریعەت وەك خۆی فام بكات، پێویستە لەنێو كۆی سەرجەم یاساو بڕیارەكانی شەریعەتدا سەرنجی بداتو، بە پاشخانێكی ئیمانیی و ئیسلامییەوە بۆی بڕوانێ.

لەکۆتایی ئەم پێشەکییەش دا دەڵێم:

أ- بێگومان بەرگری کردن لە ئافرەتانو هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی مافە ڕەوایەکانیان –کە هیچکەس ناتوانێ نکوولیی لەوە بکات کە زۆرجارو لەلایەن زۆر کەسەوەو بەزۆر جۆرو شێوە پێشێل کراون- ئەرکی سەرشانی هەموو مرۆڤێکی دڵسۆزو بەویژدانو خاوەن بەزەییە، چونکە سەرەنجام ئافرەتان نەنكو دایكو پوورو خوشكو کچو هاوسەری پیاوانن، وە هەردووك ڕەگەزی نێرو مێ تەواوکەری یەکدینو بەبێ یەکدیش ژیانو گوزەرانیان نەکراوەو ناشکرێ!

ب- بۆیە هیچکەس بۆی نیە –لە پیاوانو ئافرەتان- بەتەنیا خۆی لەئافرەتان بکاتە خاوەنو دەمڕاستو ئەو مەیدانە بۆ خۆی پاوان بکاتو، ئەو ئەرکە گرنگو شەرعییە- بەمەرجێك سەرڕاستانەو بێ غەرەز جێبەجێ بکرێ –وەك مافی لە چاپدانەوەی کتێب بۆ خۆی قۆرخ بکاتو خەڵکی دیکەی لێ بێبەش بکات!

بەڵکو ئەو ئەرکە پێویستی سەرشانی هەموو تاکێکی دڵسۆزو ویژدان زیندووی کۆمەڵگایە وەك هەر ئەركو کارێکی دیکەی پێویست.

ج- بەرگری کردن لە ئافرەتانو پشتگیریی کردنی مافە ڕەوایەکانیشیان نابێ هەر بە قسەو بانگەشە بێت، بەڵکو پێویستە ئەو کەسە –بەتایبەت ئەگەر پیاو بێ- لە خودی خۆیو هاوسەرو کچو خوشكو دەوروبەرییەوە دەست پێبکاتو، بەکردەوە ڕێزی ئافرەت بگرێو بۆی دڵسۆزبێو مافەکانی بۆ دابین بکات، ئەگەرنا کەسێك خۆی وێران بێ خەڵکی پێ ئاوەدان ناکرێتەوەو، زۆریشن ئەوانەی بانگەشەکردنیان بۆ داکۆکی لە مافو ڕێزی ئافرەت کردۆتە ئاوی لێڵو ڕاوی خراپی تێدا دەکەن!

د- پێشێلکرانی مافەکانی ئافرەتانیش لە کۆمەڵگای ئێمەدا هۆکاری بنەڕەتیو سەرەکی بریتیە لە (لادان لە شەریعەت)و مامەڵە نەکردن لەگەڵ ئافرەتدا

بەگشتی: چ دایك بێ، چ كچ، چ خوشك، چ هاوسەر، بەپێی یاساو بڕیارەكـانی شەریعەت كە لەلایەن خوای پەروەردگاری خاوەنی هەردووك ڕەگەزی نێرو مێوە بۆ بەختەوەركردنی مرۆڤـ لە دنیاداو سەرفرازكردنی لەدوا ڕۆژدا نێرراوە.

خواش یاریدەدەری هەموو لایەكمان بێت بۆ هەرچی زیاتر یەكـدی خۆشویـستن‌و بۆ یەك دڵسۆزو بە پەرۆش بوون‌و لەسەر یەكدی كردنــەوەو بــەرگری كــردن لــەڕێزو مافەكانی یەكدی.

٢٠٠٨ / ١١ /٢١

هەولێـــر



خوێنەری بەڕێــز !

ئەم بەشە لە دوو تەوەرە پێك دێ:

## تــەوەرەی یەكـــەم: بناغــەی عەقیــدەییو فیكــریی خێــزان

هــەر بەرنامــەو شــەریعەتێك بەگــشتیو یــەك یــەكی یاســاو بنەماكانیــشی، پاشخانێكی عـەقیدەییو فیكرییان هەیە، كـە پـشتی پـێ دەبەسـتنو تـامو بـۆنو ڕەنگێكی تایبەتییان پێ دەبەخشێ.

بناغەی عـەقیدەییو فیكریی خێزان (أُسرة)یش لە ئیسلامدا لـە چـەند شـتێكدا بەرجەستە دەبێ، كە ئەم سێیە سەرەكییەكانیانن:

### یــەك: مـرۆڤ جێنشــینی خوایــە لەســەر زەوی:

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِ ...﴿٣٩﴾ فاطر﴾، واتە: (خوا) ئەو كەسەیە، كە لەسەر زەوی گێڕاونی بەجێنشین...

هـــــەروەها فەرموویـــــەتی: ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ ...﴿٧﴾ الحدیـد﴾، واتە: بڕوا بە خواو پێغەمبەرەكەی بێننو لەوەدا كە گێڕاونی بە جێنشین-ی خۆی- ببەخشن.

دیارە مەبەست لە جێنشین (خلیفة)ی خوا بـوونی مــرۆڤیش ئەوەیــە، كــە خــوا مرۆڤی لەسەر زەوی داناوەو دەستیشی ئاوەڵا كردوە بۆ تەصەڕڕوف تێداكردنی، كـە دیارە بەم چەمك (مفهوم)ە مرۆڤەكان بە مسوڵمانو كافرو چاكو خراپەوە دەگونجێ پێیان بگوترێ جێنشینانی خوا (خلفـاء الله)، هەندێك لەتوێژەرەوانیش گوتوویانـە: مەبەست لە جێنشینی خوا بوونی مرۆڤ ئەوەیە كە شەریعەتو بەرنامەی خــوا لــە

زەویدا پیادەو جێبەجێ بكات، بەڵام مانای یەكەمیان لەگەڵ سیاقی ئایەتەكاندا گونجاوترە.

هەڵبەتە مەبەست لە هەڵگرتنی سپاردەی خوا (حمل أمانة الله)ش لەلایەن مرۆڤەوە پاش ئەوەی ئاسمانەكانو زەویو شاخەكان بەزمانی حاڵ، بێ توانایی خۆیانیان لەبەرانبەر ئەو ئەركەدا پیشاندا، هەر ئەو جێنشینایەتی كردنەی خوایە، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ الأحزاب﴾.

ئاشكراشە كە جێنشینی خوا بوونی مرۆڤو سپاردەی خوا هەڵگرتنیو ڕێزلێگیرانیو لە چاكترین شێوەدا دروستكرانیشی، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ...﴿٧٠﴾ الإسراء﴾، ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِيٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ التين﴾، ئەمانە هەركامێكیان مرۆڤ بە هەردووك ڕەگەزی نێرو مێیەوە بەگشتی تێیاندا بەشدارو یەكسانە.

## دوو: ئادەمو حەووا یەكەمین خێزانی مرۆڤایەتی یان لەسەر زەوی پێكهێنا:

بەڵێ هەموو مرۆڤایەتی بەتێكڕای ڕەنگو تیرەو نەتەوەكانییەوە لەیەك تاكە خێزانەوە هاتوە كە بابە ئادەمو دایكە حەووان سەلامی خوایان لێ بێ، وەك خوا عزّوجلّ فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ ...﴿١﴾ النساء﴾، واتە: ئەی خەڵكینە پارێز لەو پەروەردگارەتان بكەن، كە لە یەك نەفس دروستی كردونو هەرلەویش هاوسەرەكەی وەدیهێنا، وە پیاوانو ئافرەتانێكی زۆری لێ پەیداكردنو بڵاوكردنەوە.

كـــەواتە:

نێرو مێی یەكەم -ئادەمو حەووا سەلامی خوایـان لـێ بـێ-و سـەرجەم نێـرو مێیەكانی دیكەی بەشەر، وەك یەكو بـێ جیـاوازیی لـە وەچـە خـستنەوەو درێـژە پێدانی ژیانی مرۆڤـدا لەسەر زەوی، بەشدارو خاوەن ڕۆڵن.

## سێ: ژیانی دنیا قۆناغو شوێنی تێدا تاقیكردنەوەی مرۆڤەكـانە:

ئەمیش ڕاستییەكە خوای بەرزو بێ وێنە لەچەندان ئایەتدا خستوویەتە ڕوو، بۆ نـــــموونە: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ الكهف ﴾، واتە: ئێمە ئەوەی لەسەر زەوییـە كردوومانـە بەمایـەی پێڕازاندنـەوەی تاكو تاقییان بكەینەوە كامەیان كردەوەی چاكترە.

هــەروەها فەرموویــەتی: ﴿ الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ ﴿٢﴾ الملك ﴾، واتە: (خوا) ئەو كەسەیە، كە مەرگو ژیانی ڕەخساندوون تاكو تاقیتان بكاتەوە داخۆ كامەتان كردەوەی چاكترە، وەئەو زاڵی لێبوردەیە.

شایانی باسیشە كە تاقیكرانەوەی مرۆڤەكان لە بەندایـەتی كردنیـان بـۆ خـوادا بەرجەستە دەبێو ڕێژەی دەرچـوون، یـان دەرنەچوونیـشیان پەیوەسـتە بەئەنـدازەی بەندایەتی كردن، یان بەندایەتی نەكردنیانەوە بۆ خوا، چونكە مرۆڤ بـە ئەنـدازەی ئەوە كە بەندایەتی (عبودیة) بۆ خوا دەكـاتو خـوا دەپەرسـتێ، ئـەو حیكمـەتو ئامانجە كە بۆی دروسـتكراوە، دێنێتەدی، وەك خوا تبـارك وتعـالی فەرموویـەتی: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ الذاريات ﴾، واتــە: وە جنـدو مـرۆڤم بەس بۆ ئەوە دروست كردون كە بـمپەرستن.

كەواتە: كەسێك بەندایەتی بۆ خوا نـەكات، مانـای وایـە حیكمـەتو ئامـانجی دروستكرانی خۆی نەهێناوەتـەدیو، دیـارە بابایـەكی واش بـە كـەوتوو (راسـب)و زیانبار (خاسر) دادەنرێ، هەربۆیەش خوای كاربەجێ لـە سـووڕەتی (الـتین)دا پـاش

ئەوەی ڕایدەگەیەنێ، کە مرۆڤی لە چاکترین شێوەدا دروستکردوە، ڕوونی دەکاتەوە کە بێجگە لە بڕوادارانی چاکەکار سەرجەم مرۆڤەکان بەرەو پلەکانی خواری خوارێ شۆڕ دەبنەوەو دەدۆڕێن: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ (٤) ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ (٥) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ (٦)﴾ التين.

ئنجا شتێکی ئاشکرایە کە بەندایەتی مرۆڤەکان بۆ خوا عز وجل لەئیمان هێنانیانو گەردنکەچکردنیاندا بۆ خواو پابەندییان بەشەریعەتەکەیەوە، نمایان دەبێ، یاساکانی شەریعەتیش لەڕووی پەیوەندییان بە مرۆڤەکانەوەو ڕەچاو کردنو نەکردنی ڕەگەزیان، سێ بەشن:

**أ- بەشێکیان گشتیینو پەیوەندییان بە سەرجەم مرۆڤەکانەوە هەیە، بەدەر لە ڕەچاوکردنی ڕەگەز (نێرایەتیو مێیاتی)یان، کە ئەم بەشە زۆربەی هەرە زۆری یاساکانی شەریعەت دەگرنەوە، بۆ نموونە:**

١- لەخۆدا هێنانەدی ئیمانو ئیسلامو پارێزکاریی (تقوی)و چاکەکاریی (إحسان)و... هتد، وەخۆ دوورگرتن لە کوفرو شیركو نیفاقو گوناهکارییو خراپەکارییو... هتد.

٢- جێبەجێ کردنی ئەرکە شەرعییە گشتییەکانی وەك: نوێژو زەکاتو ڕۆژوو و حەجو عومرەو یادی خوا...

٣- ئەنجامدانی ئەرکە شەرعییە گشتییەکانی وەك: بەرپاکردنی دروشمەکانی ئایینو فەرمان بەچاکە کردنو ڕێ لەخراپە گرتنو چەسپاندنی دادگەرییو نەهێشتنی ستەمو خراپەو جەنگو جیهادو... هتد.

٤- خۆ ڕازاندنەوە بەڕەوشتو خووە بەرزەکانو ئەدەبو ئاکارە پەسندەکانو، خۆ پاراستن لە خەسڵەتو خوو و خدەو ڕەفتارو هەڵسو کەوتە نزمو پەستەکان.

خوای پەروەردگار عزّوجلّ لە ئایەتی ژمارە (٣٥)ی (الأحزاب)دا ئەرکە

سەرەكییە گشتیو هاوبەشەكانی پیاوانو ئافرەتانی مسوڵمانی ڕوون كردۆتەوە، كە بریتین لە دە (١٠) ئەركی گەورەو گرنگو فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾ الأحزاب﴾، واتە: بێگومان پیاوانی مسوڵمانو ئافرەتانی مسوڵمانو، پیاوانی بڕوادارو، ئافرەتانی بڕوادارو، پیاوانی بۆ خوا ملكەچو ئافرەتانی بۆ خوا ملكەچو، پیاوانی ڕاستو ئافرەتانی ڕاستو، پیاوانی خۆڕاگرو ئافرەتانی خۆڕاگرو، پیاوانی لەخوا ترسو پیاوانی ئافرەتانی لەخوا ترسو، پیاوانی بەخشەرو ئافرەتانی بەخشەرو، پیاوانی ڕۆژووگرو ئافرەتانی ڕۆژووگرو، پیاوانی داوێنی خۆ پارێزو ئافرەتانی داوێنی خۆ پارێزو، پیاوانی زۆر خوا لەیادو ئافرەتانی زۆر خوا لەیاد، خوا لێبوردنو پاداشتێكی مەزنی بۆ داناون.

**ب- وە بەشێكیان تایبەتن بەپیاوانەوەو ئافرەتان ناگرنەوە، بۆ نموونە:**

١- مارەیی (مَهْر) دان بە ئافرەتانێك كە دەخوازرێنو گرێبەستی هاوسەرێتییان لەگەڵ دەبەسترێ، وەك: خوای كاربەجێ فەرموویەتی: ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحْلَةً ...﴿٤﴾ النساء﴾، واتە: وە بەبێ بەرانبەر مارەیییەكان بدەنە ئافرەتان...

٢- دابین كردنی بژیوو بەرگو پۆشاك بۆ ژنو منداڵ، وەك خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ...﴿٢٣٣﴾ البقرة﴾،

واتە: وە خاوەن (باب)ی منداڵەكە لەسەری پێویستە بەشێوەیەكی بە باش زانراو و باو بژیو و پۆشاكیان (واتە: منداڵەكەو دایكی) بۆ دابین بكات.

٣- دابین كردنی جێگاو شوێنی تێدا حەوانەوەی ژنو منداڵ، وەك خوای بە بەزەیی فەرموویەتی: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ ...﴿٦﴾ الطلاق﴾، واتە: ژنو منداڵەكانتان بەپێی هەبوونتان هەرلەو شوێنەدا، كە خۆتان تێیدا نیشتەجێن، نیشتەجێ بكەن...

بەڕێوەبردنو سەرپەرشتی كردنی ژنو خێزان، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ ...﴿٣٤﴾ النساء﴾، واتە: پیاوان چاودێرو سەرپەرشتیارن بەسەر ژنانەوە، بەهۆی ئەوەوە كە خوا زێدەیی هەندێكیانی داوە بەسەر هەندێكیانداو، لە سۆنگەی ئەوەشەوە، كە پیاوان لە سامانی خۆیانیان (بۆ ژنەكانیان) خەرج كردوە.

جێی سەرنجیشە كە خوای كاربەجێ لێرەدا، كە باسی سەرپەرشتیارێتی پیاوانی كردوە بۆ ئافرەتان مەبەست چوارچێوەیماڵو خێزانە، وەك لەسیاقی ئایەتەكانەوە دیارە، ئنجا كە ئاماژەش دەكات بەهۆكارو پاساوی سەرپەرشتیارێتی پیاوان بۆ ژنەكانیان، دوو شتان دەخاتە ڕوو:

یەك: زێدەیی (فضل)ی هەندێك لەپیاوانو ژنان بەسەر هەندێكیاندا.

دوو: ماڵو سامانی خۆ خەرجكردنی پیاوان بۆ ماڵو خێزانیان.

ئنجا هەرچەندە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان ئەم ڕستە قورئانییەیان ﴿...بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ...﴾ وا لێك داوەتەوە، كە زێدەییو ئیمتیازی پیاوان بەسەر ژنانەوە دەگەیەنێو ﴿بَعْضَهُمْ﴾ یان بە پیاوانو ﴿بَعْضٍ﴾یان بەژنان داناوە، بەڵام لەڕاستیدا ئەو لێكدانەوەیە ڕاست نیە،

چونكە ئەگەر وابووایە دەبـوو گوترابـا: (بمـا فـضّل الله الرجـال علـى النـساء)، كەواتە: ئایا مەبەست لەم ڕستە قورئانیە چییە؟!

مەبەست ئەوەیە کـە خـوای کاربـەجێ کۆمـەڵێك تایبەتمەنـدیی دەروونیـیو جەستەیی لەپیاوانو ئافرەتاندا داناون، كە بوونەتە مایەی زێـدەییو ئیمتیـازی هەركام لەو دوو ڕەگەزە، بەسەر ئەوی دیكەدا، بۆ نموونە:

پیاوان بەگشتی جەستەیان قەبەترو بەهێزو پتەوترو، دەنگو سەدایان گڕترە لە ئافرەتانو، ئەوانیش لەبەرانبەردا جوانترو وردو نەرمو ناسكترن.

هەروەها پیاوان وێڕای هەبوونی سۆزو بەزەیی، عەقڵو هۆشیان بـەهێزترە لـە ئافرەتانو، ئەوانیش هەرچەندە لە عەقڵو هۆش بەهرەمەنـدن، بـەڵام بـەزەییو سۆزیان لەهی پیاوان زیاترو بەهێزترە.

شایانی باسیشە كە جیاوازییەكانی نێوان پیاو و ئافرەت زۆر لەوە ئاشـكراترو بەرچاوترن كە پێویـست بەسـەلماندنو بەڵگـە لەسـەر هێنانـەوە بكـات، زانـاو بیرمەندی گەورەو خاوەنی پاداشتی (نۆبل)، (ئەلكسیس كاریـل) لـەوبارەوە لـە كتێبێكیدا بەناوی (مرۆڤـ ئەو نەناسراوەیە- الإنسان ذلك المجهول)دا گوتوویەتی:

«ڕژێن (غدة)ە جینسییەكان بێجگە لـە پاڵپێوەنـانی مرۆڤـ بـۆ ئەنجامـدانی كاری جینسی كە مایەی وەچە خستنەوەیە، چەند ئـەركێكی دیكەشـیان هـەن: هێزی چالاكییە جەستەییو عەقڵییو ڕووحییەكان زیادە دەكـەن، هـیچ كاتێـك بابایەكی خەسێنراو نەبۆتە فەیلەسووفێكی گەورە، یان زانایەكی پایەبـەرز، یـان تەنانەت تاوانبارێكی بێڕەزاش!

چونكە گونەكان-ی پیاو-و هێلكەدانەكان-ی ئـافرەت- چـەندان ئـەركی زۆر گرنگیان هەن، ئەوانن كە خانە نێرینەییو مێینەییەكان بەرهەم دێنن، لەهەمان كاتیشدا چەند ماددەیەكی دیاریكراو دەڕژێننە نێو خوێنەوە، كە سەرجەم خانەو شانەو ئەندامو پێكهێنەرەكانی جەستەكان، وەك مـۆركردن بەتایبەتمەندییـەكانی نێرینەییو مێینەییەوە پابەند دەكەن... بێگومان جیاوازییەكانی نێوان پیاو و

ئافرەت لە شێوەی تایبەتی ئەندامەکانی زاووزێ، یان منداڵدانو ئاوس بوون، یان شێوازی پەروەردەو فێرکردنەوە پەیدا نەبوون، بەڵکو ئەو جیاوازییانە خوارسکییەکەیان زۆر لەوە گرنگترە، چونکە جیاوازییەکە لەخودی خانەو شانەکانەوە هەڵقوڵاوەو لەو ماددە کیمیاییە دیاریکراوانەوە هاتوە کە هەرکام لە گون (خصية)و هێلکەدان (مبيض) دەیانرژێننە نێو جەستەوە.﴾[1]

هەڵبەتە هەربۆیەش -وەك لە برگەی دووەمدا باسی دەکەین- ئایینو بەرنامەی خوای زاناو شارەزاو کاربەجێ بەرەچاوکردنی تایبەتمەندییەکانی هەرکام لە پیاوو ئافرەت جیاوازیی خستۆتە نێوان بەشێك لە ئەركو کارەکانیانەوە.

**ج- وە بەشێك لە یاساکانی شەریعەت تەنیا پەیوەستن بە ئافرەتانەوەو پیاوان ناگرنەوە، بۆ نموونە:**

١و٢- فەرمانبەریی کردنی مێرد (لە سنووری شەریعەتدا)و، پاراستنی ئابڕوو کەرامەتو ماڵو سامانی، وەك خوای تاكو پاك فەرموویەتی:

﴿...فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ...﴿٣٤﴾ النساء﴾، واتە: ... جا ئافرەتانی چاك فەرمانبەرن (بۆ مێردیان)و پارێزەرن (بۆ ئابڕوو ماڵو سامانی مێردیان) لەکاتی لەماڵنەبوونیاندا بەهۆی ئەوەوە کە خوا (مافەکانی) ئەوانی پاراستوە...

٣- شیر پێدانی کۆرپە، وەك خوای بەبەزەیی فەرموویەتی: ﴿وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ ...﴿٢٣٣﴾ البقرة﴾، وە دایکان دوو ساڵی ڕەبەق شیر بە منداڵەکانیان دەدەن، بۆ هەرکەسێك ویستی ماوەی شیر پێدان تەواو بکات...

---

١) بڕوانە: (الإنسان ذلك المجهول- مرۆڤ ئەو نەناسراوەیە)، ص (٧٧-٨٠)، وەرگێڕانی: (عادل شقيق) وە بڕوانە: (ئافرەتو خێزان لەسایەی شەریعەت دا) ل(٣٣-٣٥)، چاپی دووەم.

٤- خۆ داپۆشین‌و جوانیی خۆ (بێجگە لە دەم‌و چاوو هەردووك دەست هەتا مەچەك) دەرنەخستن بۆ پیاوانی نا مەحرەم، وەك خوای بەرزو بێ وێنە فەرموویەتی: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ النور ﴾، واتە: وەبەئافرەتانی بڕوادار بڵێ با لەنیگای چاوەکانیان بگرنەوەو داوێنیان بپارێزن، وە باجوانیی خۆیان جگە لەوەی کە (بەشێوەیەکی ئاسایی) دەردەکەوێ دەرنەخەن، وەبا سەرپۆشەکانیان بەسەر یەخەو بەرۆکیان دابدەن‌و جوانیی خۆیان دەرنەخەن، مەگەر بۆ مێردەکانیان، یان بابەکانیان، یان بابی مێردەکانیان، یان کوڕانی مێردەکانیان، یان برایەکانیان، یان کوڕانی برایەکانیان، یان کوڕانی خوشکەکانیان، یان ئافرەتانیان، یان کۆیلەکانیان، یان پیاوانێکی خزمەتکار کە پێویستییان بە ئافرەتان نیە، یان منداڵانێك کە جارێ ئاشنا نەبوون بە جەستەی ئافرەتان، وەبا (ئافرەتان) پێیان بەزەویدا نەکوتن بەمەبەستی پەیپێبرانی ئەو جوانییەی کە پەنهانیان کردوە، وە تێکڕا بۆلای خوا بگەڕێنەوە ئەی بڕوادارینە بەڵکو سەرفرازبن.

لەکۆتایی ئەم تەوەرەیەشدا دەڵێین:

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا کە ڕابرد دەگەینە ئەو ئەنجامگیرییە، کە پیاوان‌و

ئافرەتانێك كە دەیانەوێ ئەركی جێنشینایەتی خوا عزّوجلّ لەسەر زەوی بەباشی ئەنجام بدەنو، سپاردە (أمانة)ی خوا وەك بۆی شایستەیە هەڵبگرنو، زایەی نەكەنو، بەهۆی بەندایەتی بۆ خوا كردنیانەوە حیكمەتو ئامانجی وەدیهێنرانیان بهێننەدیو، لە تاقیكردنەوەی خوا كە لەژیانی دنیادا بۆی سازكردوون دەربچن، پێویستە:

هەوڵی جێبەجێكردنی هەرسێك بەشەكەی یاساكانی شەریعەت بدەن هەركەسە بەپێی تواناو بڕستیو بەگوێرەی چۆنیەتیو سروشتی یاساكان، كە پێشتر باسمان كرد.

دیارە دەعوای ئیمان هێنانو مسوڵمانەتییش تەنیا كاتێك لە مرۆڤ دەسەلمێنرێو بەڕاست دادەنرێ كە خاوەنەكەی چ نێر بێ، چ مێ بە قەناعەتەوە یاساو بڕیارەكانی شەریعەتی قبووڵ بنو بۆیان تەسلیمو ملكەچ بێ، ئەگەرنا ئیددیعای مسوڵمانەتی كردنو ناڕازیی بوونو ملنەدان بۆ یاساو بڕیارەكانی شەریعەت پێكەوە ناگونجێن، وەك خوا عزّوجلّ فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ الأحزاب﴾، واتە: وە هیچ پیاوێكی بڕوادارو ئافرەتێكی بڕوادار دوای ئەوەی خواو پێغەمبەرەكەی بڕیارێك دەدەن، بۆیان نیە لە بەرانبەریدا سەرپشك بن، وە هەركەسێك سەرپێچی خواو پێغەمبەرەكەی بكات، ئەوە گومڕابوونێكی ئاشكرا گومڕابووە.

ئنجا لەڕاستیدا كۆمەڵو كۆمەڵگای مسوڵمان بەبێ هاوكارییو دەستبار بۆ یەكدی گرتنی هەردووك ڕەگەزی نێرو مێ، ناتوانێ ئەركە شەرعییەكانی جێ بەجێ بكات، هەربۆیەش خوا سبحانه وتعالى فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ

ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٧١﴾ التوبة﴾، واتە: وەپیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار هەندێکیان پشتیوانی هەندێکیانن، فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لە خراپە دەکەنو نوێژ بەرپا دەکەنو زەکات دەدەن، وە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئا ئەوانە خوا بەزەیی پێیاندا دێ، بێگومان خوا زاڵی کاربەجێیە.

## تــەوەرەی دووەم: ســـروشتو پایەکـانی خێـــزان:

ئیسلام گرنگیو بایەخێکی زۆری بە خێزان داوە، چ لـەڕووی شـێوازو چـۆنیەتی بنیاتنانییەوەو چ لـەڕووی پارێزگـاریی لێکردنـیو چـۆنیەتی چارەسـەرکردنی ئـەو گرفتو کێشانەوە کە لەنێوان ژنو مێرددا پەیدا دەبن، باشترینو زەقترین بەڵگـەش لەوبارەوە ئەوەیە کە هەم لە قورئانو هەم لە سوننەتیشدا ژمارەیەکی زۆر ئایـەتو دەقی سوننەت هەن کە بەتەواویی لەبواری خێـزان (أُسـرة)دا —کـە ئێـستا زاراوەی باری کەسێتی (الأحوال الشخـصية)ی بۆ بەکاردێ- نوختەیان خستۆتە سـەر پیـت، لەحاڵێکدا کە بوارێکی گرنگی وەك حـوکمو سیاسـەت، شـەریعەت بەوەنـدە وازی هێناوە کە بە چەند دەقێکی کەم، هێڵـە گـشتییەکانیو چوارچـێوەی فراوانـی بـۆ دیاری کردوە!

دیارە حیکمەتی ئەمەش ئەوەیە کە بـواری خێـزان بـوارێکی یـەکجار گـرنگو هەستیارەو عـەقڵو ئەزموونی مرۆڤـ تواناو بڕستی بەسەردا ناشـکێ، بۆیـە خـوای کاربەجێ وەك بوارو لایەنەکانی دیکەی ژیانو گوزەران، بۆ وێنە: حوکمو سیاسەتو ئابوورییو ڕاگەیاندنو هونەرو جەنگو ئاشتی، هەربەوەندە لـێی نەگەڕاوە کەچەند بنەماو هێڵێکی گشتی بۆ دابنێو بۆشایی زۆری تێـدا بـەجێ بهێڵـێ، کـە دوایـی مرۆڤـ بەگوێرەی گۆڕانو بەرەو پێشچوونی ژیانو گوزەرانی لەبەر ڕۆشنایی بنـەماو هێڵە گشتییەکاندا کۆشش (إجتهاد)یان بۆ بکاتو بەیاسـاو بڕیـاری گونجـاو پـڕی بکاتـەوە، وەك —لـەکتێبی (تـەوژمی ئیـسلامییو عـەلمانییو خاڵـە هاوبـەشو جیاوازەکانیان)دا باسمان کردوە-، بەڵکو خوای بـە بـەزەییو کاربـەجێ لـەم بـوارە گرنگو هەستیارەدا زۆر بەوردی نوختەی خستۆتە سەرپیتو لە هـیچ مەسـەلەیەکی گرنگو بنەڕەتیدا جێگای بگرەو بەردەو مشتو مڕی نەهێشتۆتەوە.

ئێستاش بۆ ئەوەی هەم مەسەلەی گرنگیو بایەخ پێدانی شەریعەت بە خێزانو هەم سروشتو پایەكانیمان لەلا ڕوونتر بن، با سەرنجی ئەم چەند خاڵە بدەین، كە دەمانەوێ بەپوختیو گوشراویی سروشتو پایەو بنەڕەتەكانی خێزانیان تێدا بخەینەڕوو:

## یەك: خێزان تەنیا یەك جۆری هەیە، كە بریتیە لە: مێرد + ژنێك، یان زیاتر هەتا چوار:

ڕەنگە هەندێك كەس پێیان سەیربێ، كە ئەم مەسەلەیە باس دەكەین، بەڵام ئەگەر شارەزای دەنگو باسی وڵاتانی دنیا بەتایبەت ڕۆژئاوا بن، سەرسوڕمانەكەیان نامێنێ، چونكە ئێستا لە هەندێك وڵاتانی دنیادا جگە لەخێزان بەو شێوە شەرعییو سروشتییەی كە دەیزانین، چەند جۆرە خێزانێكی دیكەش پەیدا بوونو بەڕەسمییش دانیان پێدانراوە، وەك: دوو پیاو، دوو ژن، هاوەڵی كچ (girl friend)، هاوەڵی كوڕ (boy friend).

بەڵێ لە ئیسلامدا تەنیا یەك جۆرە خێزانی ڕەواو سروشتی هەیە، كە بریتیە لە پێك گەیشتنی پیاو و ئافرەتێكی بەیەك شیاو بەشێوەیەكی ئاشكراو لەسەر بناغەی گرێبەستێكی ئازادانە، وەك دواتر ئاماژەی پێدەكەین.

بەڵگەش لەسەر ئەوە كە شەریعەتی ئیسلامیی تەنیا ئەو جۆرە خێزانە بەخێزان دەزانێ، زۆرن بۆ نموونە:

﴿ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ۝٦ فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ۝٧ المؤمنون، المعارج (٣١،٣٠،٢٩)﴾، واتە: وە ئەو كەسانەی كە داوێنیان دەپارێزن، مەگەر لە هاوسەرانیان یان ئەوانەی كە بەدەستی ڕاستیانەوەن (كەنیزەكەكانیان) ئەوە لەو

بوارەدا سەرزەنشت ناکرێن . بەڵام هەرکەسێك شتێکی دیکەی بەدەر لـەوە بخـوازێ ئەوە ئەوانەن لادەر.

کـــــەواتە:

بێجگە لە هاوسەرگیریی باوی نێوان پیـاوو ئـافرەت، هــەرجۆرە پەیوەندییــەکی دیکەی جینسی قەدەغەو ناڕەوایە.

دیارە کەباسی کۆیلەو کەنیزەکیش کراوە لـە قورئـاندا، چ لێـرەداو چ لـە هــەر شوێنێکی دیکەدا وەك شتێکی کردەیی‌و ئەمری واقیع باسکراوە، نەك وەك شتێکی پەسندو خوازراوی ئیسلام، بەبەڵگەی ئـەوە کـە لـە هـیچ ئایـەتێك دا باسـی بـە کۆیلـەکردنی مرۆڤــ نـەکراوە، بـەڵکو بەپێـچەوانەوە لەچـەندان ئایـەتدا باسـی ئازادکردنی کۆیلان کراوە، بۆ نموونە: ئایەتی ژمـارە (٩٢)ی (النـساء) کـە باسـی کەفارەتی کوشتنی هەڵە (خطأ) دەکات، وەئایەتی ژمارە (٨٩)ی (المائـدة) کەباسی کەفارەتی سوێند دەکات، وەئایەتی ژمـارە (٣)ی (المجادلـة) کـە باسـی کـەفارەتی (ظهار) دەکات. وە قورئان یەکەمین کتێب‌و بەرنامە بوو، کە زەمینەی ڕزگارکردنی کۆیلان‌و بنەبڕکردنی دیاردەی بەکۆیلەکردنی مرۆڤی ڕەخساند.

## دوو: ژن‌و مێـــرد لـــە مرۆڤایـــەتی‌و بەندایـــەتییان بـــۆ خـــواو بەپرسیارێتییان لە بەرانبەر دین‌و ژینی کۆمەڵگـادا یەکسانن:

وەك خـــوای زاناو توانا فەرموویەتی:

* ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا ...﴿٢١﴾ ﴾الروم، واتە: وە لە نیشانەکانی (پەروەردگارێتی خـوا) ئەوەیـە، کـە لـەخۆتان هاوسـەری بـۆ ڕەخساندوون.

هەروەها فەرموویەتی:

* ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَٰئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ النساء﴾، واتە: وەهەرکەسێك لەنێر، یان لەمێ، کردەوە باشەکان بکاتو بڕواداریش بێ، ئەوە ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو هێندەی شوێنکەی سەر نێوکە خورما ستەمیان لێناکرێ.

هەروەها فەرموویەتی:

* ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ ... ﴿٧١﴾ التوبة﴾.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی:

* **(کلّکم راع وکلّکم مسئول عن رعّیة...)** متفق علیە، واتە: هەرکامێکتان چاودێرەو بەرپرسیاریشە بەرانبەر بە کۆمەڵگاکەی...

بەڵێ ئیسلام لەو ڕووەوە کە ژنو مێرد یان ئافرەتو پیاو بەگشتی هەردووکیان مرۆڤنو خاوەنی خود (نفس)ێکی بەشەریینو، لەو ڕووەوە کە هەردووکیان بەندەی خوانو، لەو ڕووەوە کە هەردووك ڕەگەزی نێرو مێ دوو پێکهێنەری هەر کۆمەڵگایەکن، بەیەك چاو تەماشای کردونو پێکەوەی یەکسان کردونو هیچ فەرقو جیاوازییەکی نەخستۆتە نێوانیانەوە، بەڵام ئایا یەکسان بوونی ژنو مێرد، یان ئافرەتو پیاو لە مرۆڤ بوونو بەندەی خوا بوونو بەرانبەر بەکۆمەڵگا بەرپرسیاربووندا، مانای وایە کە ئافرەتو پیاو هیچ جیاوازییەکی سروشتییان لەنێواندا نیەو، لە هەموو شتێکداو لە هەموو ڕوویەکەوە وەك یەکنو، حەتمەن دەبێ هەردووکیشیان یەك جۆرە ئەركو کار وەئەستۆ بگرن ؟!!

شەریعەت دەڵێ: بێگومان نەخێر، دیارە لەم نەخێر گوتنەشدا واقیعو فیطرەتو عەقڵو زانست پشتگیریی شەریعەتی خوای بەرزو مەزنن، بابزانین چۆن؟!

## شـایەدیی دانـی واقیـع:

هەرکەسێك بەوردی سەرنج بداتە کۆمەڵگاکانی بەشەر بەگشتیو تێکڕایی، بـە مسوڵمانو نا مسوڵمانو دیندارو بێ دینو کۆنو تازەوە، تەنانەت ئەوانەشـیان کـە بەهەموو توانایانەوە دەهـۆڵی بانگەشـەی یەکـسانییو وەك یـەکبوونی ژنو پیـاو دەکوتنو لەمێژە ئافرەتیان لەماڵو حاڵی خۆی وەدەرنـاوەو، وازیـان پـێ لەئـەرکی سروشـتییو فـیطرِیـی خـۆی هێنـاوە، مەگـەر بەدەگمـەن ئەگـەرنا ئـافرەتێکی فەیلەسووف، یان سەرۆكو پاشا، یان فەرماندە، یـان مێـژوونووس، یـان دۆزەرەوە (مُکْتَشِفْ)،..هتـد، لـەنێو ئـاپۆڕای پیـاوانی فەیلەسـووفو پادشـاو سـەرۆكو فەرماندەو مێژوونووسو دۆزەرەوەو...هتددا نابینیێ!

هەردوور نەڕۆین ئەوەتا دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمـەریکای هـەڵگری مەشخەڵی لیبرالیزمو دیموکراسییو یەکـسانی ژنو پیـاو، لەسـەرەتای مێژوویـەوە هەتا ئەمڕۆ تەنانەت یەك جاریش ژنێك نەبۆتە سەرۆك!

جا دیارە ئەم دیاردەیە ئەگەر تەنیا لە جیهانی ئیـسلامییدا بووایـە، دەگونجـا بەوە پاساو بدرێتەوە، کە ئەوە فیتی پەروەردەی ئایینییە، بەڵام لـە حاڵێـكدا کـە خۆمان لە بەرانبەر حاڵەتو دیاردەیەکی ئاوا جیهـانییو گـشتگیردا دەبینینـەوە، عەقڵو مەنتیق ناچارمان دەکەن دانی پێـدا بنـێین کـە هۆکـاری پەیـدابوونی ئـەو حاڵەتو دیاردە مرۆییو جیهانییە، هەر دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی نێوان پێکهاتـەی سروشتیی پیاوو ئافرەتو، خوای کاربەجێ کەسایەتی هـەرکام لـە پیـاو و ژنـی وا هەڵخستوە، کە لە هەنـدێك کاروبـاردا توانـاو ئامـادەیی زیـاتری هـەبێو، پـێش ڕەگەزەکەی دیکە بکەوێتەوە.

## شایەدی دانی سروشتو فیطرەت:

ئافرەتان لە هەر کۆمەڵگایەك دابنو بەدرێژایی مێژووی بەشەر، لەناخیانەوە هەستی دایکایەتیو ماڵدارییو کابانییان هەر هەبووەو هیچ ئافرەتێك نیە - مەگەر میزاجی تێکچووبێ- کە حەزنەکات هێلانەو ماڵو حاڵی خۆی هەبێو لە سێبەری ماڵو مێردی خۆی دا ژیان بگوزەرێنێ، وەکاتێك ئافرەتان لەو حاڵەتە خوارِسكو خوازراوەی سروشتیان بەهەر هۆیەکەوە بێ بێبەش دەبن، هەست بە دڵتەنگییو نا ئارامییو بەدبەختی دەکەنو وا هەست دەکەن کە شتێکیان لێ ون بووە، هەربۆیەش لەو ولاتانەدا، کە ئافرەتان ناچاری کارو کاسبییو لەماڵ چوونە دەرەوەو بژیو پەیداکردن دەکەن، بێزارییو نارەزایی لەو حاڵەتە ناسروشتییەیان دەردەبرِنو داوای بوونی ماڵو حاڵی خۆیان دەکەن!

بەڵێ مێینایەتی (أُنوثة) ئافرەت داخوازیی چەند شتێك دەکات، کە بەتایبەتمەندێتی ئافرەت دادەنرێن، وەك چۆن نێرینایەتی (ذكورة) پیاویش چەند شتێك دەخوازن کە بەتایبەتمەندی پیاو دادەنرێنو، وەك یەك تەماشاکردنی ئەو دوو رِەگەزە لە هەموو شتێكدا، نادیدە گرتنی ئەو تایبەتمەندییانە (خصائص)یان کە لەسروشتو رِەگەزی هەرکامێکیانەوە هەڵدەقوڵن، شتێکی بێ جێو هەڵەو پێچەوانەو دژی فیطرەتیانە.

## شایەدیی دانی عەقڵو زانست:

بۆ خستنە رِووی چۆنیەتی شایەدیی دانی عەقڵو زانست لەوبارەوە کە ناگونجێو شتێکی رِاست نیەو بەهەڵە لێتێگەیشتنی چەمكو واتای (یەکسانیی نێوان ئافرەتو پیاو)ە، کە بێنین لە هەموو رِووێکەوە یەك جۆرە مامەڵە لەگەڵ ئەو دوو رِەگەزەدا بکەینو لە هەموو شتێكدا وەك یەکیان لێ بکەین!! با جارێکی دیکە گوێ بۆ زاناو بیرمەندی ناودار (ئەلکسیس کاریل) بگرین، ئەم زانا ناوادارە پاش

ئەو قسانەی کە پێشتر لێیەوە نەقڵمان کردن، دەڵێ[1]:

(...جا لە ئەنجامی ئەوەدا، کە ئەوانەی بەرگرییان لە مێینەیی (أُنوثة) کردوە لەو ڕاستییە جەوهەرییانە بێئاگابوونە، پێیان وابووە کە دەبێ هەردووك ڕەگەزەکە یەك جۆرە خوێندن بخوێنن، وەپێویستە یەك جۆرە هێزو وزەیان پێبدرێو بەرپرسیارێتی وەك یەکیان پێبسپێررێ!

بەڵام لەڕاستیدا ئافرەت زۆر لەپیاو جیاوازەو هەر خانەیەك لە خانەکانی جەستەی مۆرکی ڕەگەزەکەی خۆی پێوەیە... هەروەها هەموو ئەندامەکانیشی هەروان، لە سەرووشیانەوە کۆئەندامی مێشکی...

دەبێ بزانین کە یاسا کار ئەندامییەکان (القوانين الفسيولوجية)یش وەك یاسا گەردوونییەکان، کارشکێنییان لەگەڵ ناکرێو ناکرێ ئارەزووە ئینسانییەکان جێگایان بگرنەوە، بۆیە ئێمە ناچارین وەك خۆیان، کە هەن ئاوا قبووڵیان بکەین.

جا لەسەر ئافرەتان پێویستە کە کەسایەتی خۆیان بەگوێرەی سروشتی خۆیان گەشە پێبدەنو هەوڵنەدەن لاسایی نێرینەکان بکەنەوە، چونکە بەتەئکید ڕۆڵی ئەوان لە پێشخستنی ژیار (حضارة)دا لە هی پیاوان بەرزترە، بۆیە نابێ دەستبەرداریی ئەرکە سروشتییە دیاریکراوەکانی خۆیان ببن.

پاشان لە کۆتاییدا دەڵێ:

بێگومان گرنگی ئەرکی ئاوس بوونو منداڵ بوون بۆ دایك، هەتا ئێستا، وەك پێویست نەزانراوە، لەگەڵ ئەوەشدا، کە ئەو ئەرکە پێویستە بۆ کامڵبوونو گەشەکردنی ئافرەت.

بۆیە زۆر کەودەنییە کەوا لە ئافرەت بکەین نکوولیی لە دایکایەتی بکات.

---

١) (مرۆڤ ئەو نەناسراوەیە – الإنسان ذلك المجهول)، ص (٧٧-٨٠).

لەبەرئەوە پێویستە هەمان فێركردنو ڕاهێنانو هیواو ئاوات لەدڵدا ڕوواندنی عەقڵیی‌و ماددیی، كە بۆ كوڕان تەرخانكراوە بۆ كچان دانەنرێ، بەڵكو پێویستە پەروەردەكەران گرنگییەكی زۆر بەتایبەتمەندییە عەقڵیی‌و ئەندامییەكانی نێرو مێ بدەن.

هەروەها گرنگی بە ئەركە سروشتییەكان بدەن، چونكە لەنێوان دوو ڕەگەزەكەدا چەندان جیاوازیی وا هەن، كە هەڵناوەشێنرێنەوە، بۆیە هیچ چارمان نیەو دەبێ لە بنیاتنانی جیهانێكی شارستانییدا حیسابی ئەو جیاوازییانە بكەین‌و لەبەرچاویان بگرین).

دیارە هەر لێرەشدا حیكمەتی قەدەغەكردنی خۆ وێكچواندن (تشبُّه)و لاسایی كردنەوەی هەركام لەژنانو پیاوانمان بۆ دەردەكەوێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **((لیس مِنّا مَنْ تشَبَّهَ بالرجال من النساء، ولا مَنْ تشَبَّه بالنساء من الرجال))** رواه أبو داود بسند صحيح، واتە: ئەو ژنانەی كە خۆیان وەك پیاوان لێدەكەن لە ئێمە نین، وە ئەو پیاوانەی خۆیان بەژنان دەچوێنن لە ئێمە نین.

وە لە (صحيح البخاري)دا هاتوە: **((لَعَنَ رسول الله ﷺ المتشبِّهين من الرجال بالنساء، والمتشبِّهات من النساءِ بالرجال))**، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی لەو پیاوانە كردوە، كە خۆیان بەژنان دەچوێنن، وە ئەو ژنانەی كە خۆیان بەپیاوان دەچوێنن.

ئنجا پێویستە لەو ڕاستییەش بێئاگا نەبین، كە پاڵنەرو هۆكاری سەرەكی جەخت كردنەوەی ئەوانەی كە بەڕواڵەت بەرگری لە ئافرەت دەكەن، لەسەر ئەوە كە ئافرەت‌و پیاو لە هەموو شتێكدا وەك یەكن، ئەوەیە كە مێینایەتی (أُنوثة) بە كەمێتی (نقيصة) دەزانن‌و، پێیان وایە كە بەبێ سەلماندنی وەك یەكبوونی پیاوو ئافرەت لە هەموو شتێكداو بەبێ نكوولیی كردن لە جیاوازییەكانیان، یەكسان بوونی ئافرەت‌و پیاو لە مافەكانیاندا دەستەبەر نابێ! بەڵام بەڕاستی وانیەو خراپ

بە هەڵەداچوونە، چونکە:

أ- نە نێرینایەتی (ذكورة) لە خودی خۆیدا پەسندیی (فضيلة)یەو، نە مێینایەتی (أُنوثة)یش کەمێتی (نقيصة)یە، چونکە ما قووڵ نیە هۆی بەرزیی‌و نزمیی مرۆڤەکان شتێك بێ، کە دەستیان لە وەدەستهێنانی‌دا نیە، وە لە هیچ دەقێکی شەریعەتیش‌دا شتی وا باس نەکراوە.

ب- ڕێزو حورمەتی مرۆڤەکان‌و دابینکردنی مافەکانیان هیچ پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە، کە لە هەموو شتێك‌دا وەك یەك بن‌و هیچ جیاوازییەکیان نەبێ، با بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست وێنەیەك بێنینەوە:

ئاشکرایە کە بابایەکی پزیشك‌و بابایەکی ئەندازیار هەرچەندە لە مرۆڤبوونیان‌دا یەکسانن، بەڵام کارو پسپۆڕییان لەیەك جیاوازە، جا ئایا بۆ ئەوەی یەکسان بن پەکیان لەسەر ئەوە کەوتوە کە واز لەکارو پسپۆڕیی تایبەتی خۆیان بهێنن‌و، هەرکامیان کاری ئەوی دیکە بکات؟! بێگومان نەخێرو هەر لێرەشەوەیە، کە پێشینانمان گوتیانە: (نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب).

کەواتە:

یەکسانیی پیاوو ئافرەتیش لە مرۆڤبوونیان‌و بەندەبوونیان بۆ خواو بەرپرسیارێتی‌یاندایە بەرانبەر بە دین‌و ژینی کۆمەڵگاکەیان‌و، بەهیچ جۆرێك ئافرەت بۆ یەکسانبوونی لەگەڵ پیاودا پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە، کە بیسەلمێنێ هیچ جیاوازیی لەگەڵ پیاودا نیەو، نکوولێی لەمێینایەتی‌و ئەو تایبەتمەندییانەی خۆی بکات، کە لە مێینایەتییەوە هەڵدەقوڵێن‌و، بێنێ خۆی لەو ئیش‌وکارانەوە هەڵقورتێنێ، کە هی پیاون‌و بە پیاو نەبێ ناکرێن، یان بە پیاو چاکتر دەکرێن‌و واز لە ئەرکە خواڕسك‌و سروشتییەکانی خۆی بێنێ، کە بەخۆی نەبێ ناکرێن! چونکە لە ئاوا حاڵێك‌دا:

یەکەم: هەرگیز ناتوانێ ئیسپاتی ئەوە بکات، کە هیچ جیاوازیی لەگەڵ پیاودا نیەو واقیعو فیطرەتو عەقڵو زانست لەدژینی.

دووەم: وە بەنکوولّیی کردنی لە مێینایەتی خۆیو تایبەتمەندییە سروشتییەکانی، لە مێینە (أُنثی) بوون ناشۆرێو نابێتە نێرینە!

سێیەم: وە بەواز لێهێنانی ئەرکە خوارِسكو سروشتییەکانیو خۆ هەڵقورتاندنی لە ئیشو کارەکانی پیاو، ئەوەی کە باشی دەزانێ ئەنجامی نـاداتو، ئـەوەی کـە تێیدا ناکارامەو کۆڵەوارە خۆی پێوە خەریك دەکاتو، سەرەنجام لەدوو سـەرەوە زیان دەکاتو عەلی کوڕی ئەبوو طالیبیش خوا لێی ڕازی بـێ جـوانی گوتـوە: (قیمة المرءِ ما يُحْسِنُهُ)، واتە: نرخی مرۆڤ لە کارێـكدا دەردەکـەوێ، کـە بـە باشی دەیکات!

کـــەواتە:

ڕاسـتو ڕەوا ئەوەیـە کـە –وەك شـەریعەتی خـوای کاربـەجێ فەرموویـەتی-: پیاوانو ئافرەتان بەگشتیو ژنو مێردەکان بەتایبەت، ئەرکو کارە هاوبەشـەکانیان پێکەوەو بەهاوکاری ئەنجام بدەن، پاشان هەرکامێکیان بەئەركو کارە خـوا ڕسـكو سروشتییەکانی خۆی هەڵسێو، پیاوان پیاوەتی خۆیانو ئافرەتانیش ژنایەتی خۆیان لـە بـواری پـسپۆڕیی خۆیانـدا بەرجەسـتەو ئیـسپات بکـەن، ئیـدی بـەمجۆرە هەرکامێکیان بەچاکترین شێوە ئیسپاتی شایستەییو لێهاتوویی خۆیشی دەکاتو، خزمەتی خێزانو کۆمەڵگایەکەشی دەکات!

## سێ: خێزان لەسەر بناغەی گرێبەست (عقد)ێکی ئازادانەو ئارەزوومەندانەی ڕوون و ئاشکرای نێوان پیاوو ئافرەتێکی بۆ یەك حەڵاڵ بنیات دەنرێ:

ئەم پایەو بنەڕەتە گرنگەی پێکەوەنانی خێزان لەم چەند خاڵەدا ڕوون دەکەینەوە:

**١- ئەو پیاوو ئافرەتانەی دەیانەوێ ببنە هاوسەری یەکدی دەبێ بۆ یەك حەڵاڵ بن:**

وەك خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ... ﴿٣﴾ النساء﴾، واتە: دەجا ئەو ئافرەتانەی کە بۆتان حەڵاڵن بخوازن و مارە بکەن.

جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئافرەتانی حەڵاڵ و شیاو بۆ هاوسەرگیریی زۆر زیاترن لەوانەی قەدەغەن، کتێبی خوای کاربەجێ وەك عادەتی خۆی، هەموو ئەو جۆرە ئافرەتانەی، کە بەپیاو ناشێن سەرژمێری کردون، تاکو هەرچی نەکەوتە ئەو جوغزەوە بزانرێ کە ڕەوایە، ئەو ئافرەتانەش کە بۆ هاوسەرگیریی ڕەوانین ئەم چواردە (١٤)یەن وەك خوا عزّوجلّ لە ئایەتەکانی (٢٣،٢٤)ی (النساء)دا باسی کردون:

١- دایك، ٢- کچ، ٣- خوشك، ٤- پوور (خوشکی باب)، ٥- پلك (خوشکی دایك)، ٦- کچی برا، ٧- کچی خوشك، ٨- دایکی شیریی، ٩- خوشکی شیریی، ١٠- خەسوو، ١١- کچی هاوسەرێك کە مێرد چووبێتە لای، ١٢- بووك (هاوسەری کوڕ)، ١٣- کۆکردنەوەی دوو خوشك لە یەك کاتدا، ١٤- ژنی هاوسەردار.

**٢- پیاوەکە داوای ئافرەت دەکات و مارەییش وەك دیارییەك و بەڵگەیەك لەسەر ئارەزوومەند بوونی بۆی، بە ئافرەت دەدات:**

وەك پێشتر باسمان کرد شەریعەتی خوای کاربەجێ لە هەموو یاساکانیدا سروشت و پێکهاتەی مرۆڤەکانی ڕەچاوکردوە، جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئافرەت

بە خوارِسك حەزدەكات خوازراو داواكراو (مرغوب و مطلوب)بێ، بە پێچەوانەی پیاوەوە، كە بەسروشت حەزدەكات دەستپێشخەرو داواكار (مبادر و طالب)بێ، شەریعەتی ئیسلام پیاوانی وادار كردوە، كە بە مەبەستی هاوسەرگیریی ئافرەتان بخوازنو مارەیان بكەن، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ ﴿٢٣٥﴾ البقرة ﴾، واتە: وەگوناهتان ناگا بەهۆی ئەوەوە، كە ئاماژەی پێدەكەن بەخواستنی ئافرەتان، یان لەدڵی خۆتاندا پەنهانی دەكەن، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ ..فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ..﴿٣﴾ النساء ﴾.

هەروەها فەمانیشی پێكردون، كە مارەیی (مَهْر) وەك دیارییەكی ئارەزوومەندانە بدەنە ژنانێك كە بەهاوسەریان دەگرن، وەك خوا عزّوجلّ فەرموویەتی: ﴿ وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ نِحْلَةً ۚ ...﴿٤﴾ النساء ﴾، واتە: وە وەك دیارییەكی بێ بەرانبەر مارەییەكانیان بەئافرەتان بدەن.

## ٣- كاكڵەی پرۆسەی بنیاتنانی ژیانی هاوسەریی ئەو گرێبەستەیە، كە بە شێوەیەكی ئازادانەو ئارەزوومەندانە لە نێوان ژنو مێردا ئەنجام دەدرێ:

قورئان لە چەند شوێنێكدا باسی ئەو گرێبەستەی كردوەو بە ﴿ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ ﴾و بە ﴿ مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴾ پێناسەی كردوە، بۆ نموونە:

یەك: لە ساقێكدا كە باسی مارەكردنەوەی ژنانی بێوەژن دەكات، پاش بەسەرچوونی عیددەیان، كە چوار مانگو دە شەوە، فەرموویەتی: ﴿ ...وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَـٰبُ أَجَلَهُۥ ۚ ..﴿٢٣٥﴾ البقرة ﴾، واتە: وە بڕیاری یەكجارەكی لەبارەی گرێبەستی هاوسەرگیرییەوە مەدەن، هەتا كاتی عیددەكە بەسەر دەچێ.

دوو: هەروەها لە سیاقێكدا، كە باسی ڕەوا نەبوونی وەرگرتنەوەی هیچ شتێك لەو مارەییەی، كە پیاو دەیداتە ژنەكەی پاش ئەوەی لەیەك جیا دەبنەوە، خوا سبحانە وتعالی گرێبەستی هاوسەرێتی بە پەیمانێكی پتەو ﴿مِّيثَٰقًا غَلِيظًا﴾ ناوبردوە، وەك فەرموویەتی: ﴿وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾ النساء﴾.

پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی:

**((واتقوا الله في النساء، فإنكم أخذتموهنَّ بأمانة الله واستحلَلْتم فروجَهُنَّ بكلمة الله))** رواه مسلم، واتە: وە لەبارەی ژنانەوە پارێز لە خوا بكەن! چونكە ئێوە وەك سپاردەی خوا گرتوونو، بە وشەی خوا داوێنتانیان بۆ خۆتان حەڵاڵ كردوە.

بۆ سەلماندنی ئەوەش كە ئەو گرێبەست (عَقْد)ە پێویستە بە شێوەیەكی ئازادانەو ئارەزوومەندانەی هەردووك لا ئەنجام بدرێ ئەگەرنا ڕەوا نیە، بەڵگە زۆرن، بۆ نموونە:

١) خودی گرێبەست بوونی پڕۆسەكە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، كە دەبێ هەردوولای گرێدەری ئەو پەیمانە بە ئیرادەو خواستی ئازادانەو ئارەزوومەندانەی خۆیانەوە بیبەستن، ئەگەرنا لەكاتی هەبوونی فشارو ناچاركردن (ضغط وإكراه)دا ئەو پڕۆسەیە نێوەڕۆكی خۆی لەدەست دەداتو پێویستە ناوەكەیشی لەسەر نەمێنێ!

٢) خوای بەرزو بێوێنە لەبارەی چۆنیەتیو سروشتی پەیوەندی نێوان ژنو مێردەوە فەرموویەتی: ﴿...هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ..﴿١٨٧﴾ البقرة﴾، واتە: ژنەكانتان پۆشاكن بۆ ئێوەو ئێوەش پۆشاكن بۆ ئەوان.

جا دیارە هیچكەس بەویستو خواستی ئازادانەی خۆی نەبێ پۆشاك

ناپۆشێ، ئەدی چۆن شەریعەتی دادگەری خوا عز وجل ڕێ دەدا كە ژنو مێرد بەسەر یەكدا فەرز بكرێن، كە دەبێ تەمەنێك پێكەوە بگوزەرێنن؟!

٣) (البخاري) لە كتێبەكەی خۆیدا لەژێر ناوونیشانی: (باب لاینكحُ الأبُ وغيرُهُ البكر والثَّيِّبَ الاّ برِضاها)، واتە: (باسی ئەوە كە، نە باب‌و، نە كەسی دیكەش كچ‌و بێوەژن بە ڕەزامەندیی خۆی نەبێ مارە نابڕێ)دا، ئەم فەرمایشتەی هێناوە: (لا تُنْكَحُ الأَيِّم حتى تُسْتَأْمَر ولاتُنْكحُ البكر حتى تُسْتَأْذَنَ) ژمارە: ٥١٣٦، واتە: بێوەژن مارە ناكرێ هەتا ڕاوێژی پێ نەكرێ، وە كچ مارە نابڕێ هەتا ڕەزامەندیی وەرنەگیرێ.

٤) هەروەها (البخاري) لەژێر سەرباسی: (بابُ اذا زوَّجَ ابنتَهُ وهي كارهة فَنِكاحُهُ مَرْدود)، واتە: (باسی ئەوە كە هەركەسێك كچەكەی مارەبڕی لە یەكێك كە پێی ڕازی نەبوو، ئەوە مارەبڕانەكەی هەڵوەشاوەیە)دا، ئەم فەرمایشتەی هێناوە: (عن خَنساء بنت خِذام الأنصارية أنَّ أباها زوَّجها وهي ثَيِّبٌ فكرِهَتْ ذلك فأتت رسول الله ﷺ فَرَدَّ نِكاحَهُ)، واتە: خەنسائی كچی خیذامی ئەنصاریی گوتوویەتی: بابی بەبێوەژنیی لەكەسێكی مارەبڕی ئەویش پێی ناخۆش بوو، جا هاتەلای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش ئەو مارەكردنەی كە بابی پێی هەڵسابوو، هەڵوەشاندەوە.

## ٤- پێویستە ئەو گرێبەستە بە شێوەیەكی ئاشكراو ڕوون بێت‌و هیچ تەم‌ومژێكی بەسەرەوە نەبێ:

زانایانی ئیسلام هەموویان لەسەر ئەوە كۆكن، كە دەبێ گرێبەستی نێوان ژن‌و مێرد بە شێوەیەكی ئاشكراو ڕوون بێت‌و پەنهان نەبێ، جا دیارە هەندێكیان لەوبارەوە، كە ئایا هەبوونی سەرپەرشتیار (ولي الأمر) لەكاتی مارە بڕینەكەدا پێویستە، یان هەر سوننەتە؟ وە ئایا هەركام لە شایەدیی لەسەردران‌و ئاشكرا كران، پێویستن، یان یەكێكیان بەسە؟ ڕاجیاییان هەیە كە بە پێویستی نازانم

لێرەدا بچینە نێو ئەو وردەکارییانەوەو لـەجێی دیکـەدا باسمـان کـردوون[١]، بـەڵام ئەوەی هەموویان لەسەری یەکـدەنگن ئەوەیـە، کـە هـەرکات پڕۆسـەی مـارەبڕین شـایەدیی لەسـەردران‌و ئاشـکراکرانی تێداهاتنـەدی، ئـەوە هـیچ مـشـتومڕێك لەڕاسـتو دروسـتیدا نیـە، وەك (إبـن تیمیـة) گوتوویـەتی: (اذا اجتمع الإشـهاد والإعلان فهـذا الـذي لانِـزاع في صِـحَّتهِ)[٢]، هـەروەها هەمووشـیان لەسـەر ئـەوە ڕێککەوتوون کە هەر مارە کردنێك هیچ کام لەشایەدیی لەسەردران‌و ئاشـکراکرانی تێدا نەهاتبنە دی نارەوایەو لە حـوکمی زینـا دایـە، وەك (إبـن تیمیـة) لـەوبارەوە گوتوویەتی: (نِكاحُ السِّرِّ الذي يتواصون بِكتمانه ولايُشْهِدون عليه احداً باطـلٌ عنـد عامة العلماء وهو من جنس السِّفاح)[٣]، ئەمـەش چـەند فەرمایـشتێك لـەبارەی پێویست بوونی هەرکـام لە:

ئامادەبوونی سەرپەرشتیار (وليِّ الأمر)و شـایەدیی لەسـەردران‌و ئاشـکراکران، لەکاتی ئەنجامدانی پڕۆسەی مارەکردندا، بۆ ڕەوابوونی:

(لانكاح الاّ بوليٍّ وشاهِدَينْ) رواه ابن حِبّان في صحيحه والـدار قطـني والبيهقـي وصَحَّحه الألباني من عائشة رضي الله عنها، واتە: مارەکردن بەبێ سەرپەرشتیارو دووشایەد دروست نیە.

(أَعلِنوا هذا النكاح واجعلوه في المساجِد واضْرِبوا عليه بالـدُّفوف) رواه الترمـذي عن عائشة رضي الله عنها، واتە: ئەم مارەکردنە ئاشکرا بکەن‌و با لـە مزگـەوتان بێت‌و دەفانیشی لەگەڵ لێبدەن.

---

١) بڕوانە: (ئافرەت‌و خێزان لەسایەی شەریعەتدا)، چاپی دووەم، بەشی چوارەم: گرنگیـی‌و چـۆنیەتی بنیاتنانی خێزان، لاپەڕە (٣٠٧-٣٦٧).
٢) بڕوانە: (مجموع الفتاوی)، ج٣٣، ص١٥٨.
٣) هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٣٠.

## چـوارەم: هـەوێن‌و هـەناوی ژن‌و مێردایـەتی و هاوسـەرێتیی بریتیـە لـە پێكـــەوە هۆگربـوون‌و یەكـــدی خۆشویـستن‌و ســـۆزو بـەزەیی بـۆیەك هەبوون:

بەڵێ لەڕوانگەی شەریعەتی بێ هەڵەو پەڵەی خوای بەرزو بێ وێنەوە پەیوەنـدی نێوان ژن‌و مێرد بەرلـەوەی بەیەككەیـشتنی جەسـتەیی‌و ڕواڵـەتی بێـت، پێكـەوە ئاوێتەبوونێكی ڕووحیـی‌و مەعنەوییـە: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ الروم﴾، واتە: وە لە نیشانەكانی (پەروەردگارێتی خوا) ئەوەیـە كـە لەخۆتان هاوسەرانێكی بۆهێناونە دی تـاكو پێیانـەوە هـۆگربن، وەخۆشەویـستی‌و بەزەیی خستۆتە بەینتانەوە، بێگومان لەوەدا نیشانە گەلێك هەن بۆ كەسـانێك كـە بیردەكەنەوە.

وە لەڕاستیدا هەركاتێك ژن‌و مێرد بەوشێوەیە نەبوون كە خوای كاربەجێ باسـی كردوە، دەبێ نیشانەی پرسیار بخەنەسەرخۆیان‌و چاو بەخۆیانـدا بگێڕنـەوەو خۆیـان ڕاست بكەنەوە.

شایەنی باسیشە كە هەركارێك بناغەو سەرەتایەكەی ڕاست‌و ڕێك بوو، مەگـەر چۆن دەنا دوایی نارێك‌و لار دەرناچێ، هەربۆیەش شەریعەتی خـوای پـەروەردگار - وەك پێشتر خستمانەڕوو- گرنگیی‌و بایەخێكی زۆری بە بناغەو سـەرەتاو شـێوازی بنیاتنانی خێزان‌و گرێدانی پرۆسەی هاوسـەرگیریی داوە، بۆنموونـە: باسـەرنجی ئـەم چەند فەرمایشتە بدەین كـە چـۆن پێغەمبـەر ﷺ ئامۆژگـاری هـەركام لـەپیاوی عەودالی هاوسەرگیریی‌و، كەس‌وكارو سەرپەرشتیاری ئافرەتی خواسـتراو دەكـات، كە بێگومان ئەگەربێت ئـەم ڕێڕوونیـی‌و ئامۆژگارییانـەو هاووێنـەكانیان لەلایـەن هەركام لە بابای ژنهێن‌و، خێزان‌و كەس‌وكاری ئافرەت بەشوودەرەوە ڕەچاو بكـرێن‌و

کاریان پێ بکرێ، خێزانێك بنیات دەنرێ کە وەك خوای بەبەزەیی پێناسەی کردوە، هەوێنەکەی بەزەیی‌و سۆزو خۆشەویستی‌و ڕێزو حورمەتی دووسەرەی نێوان ژن‌و مێرد دەبێت:

١- (( **تُنكحُ المرأةُ لأربعٍ: لمالها ولِحَسَبِها ولِجمالِها ولِدينها، فاظْفَرْ بِذات الدين تَرِبَتْ يَداك** )) متفق عليه، واتە: ئافرەت لەبەر چوار شتان بەهاوسەر دەگیرێ: بۆ سامانەکەی، وە بۆ خانەدانییەکەی، وە بۆ جوانییەکەی، وە بۆ دینداریيەکەی، دەجا هەوڵی دەستگیرکردنی دیندارەکە بدە دەستت بە خۆڵ بێ! (واتە: ئەگەر وانەکەی نەداربی! ).

٢- (( **تزوَّجوا الودود الولود فأنِّي مكاثِرٌبكم الأمم** )) رواه أبوداود، واتە: ئافرەتی مێرد دۆستی زاووزێکەر بێنن، چونکە من شانازیی بەزۆریتانەوە دەکەم بەسەر ئۆممەتانی دیکەدا.

٣- (( **تَخَيَّروا لِنُطفِكم وانكِحوا الأكْفاءَ وأنكِحوا اليهم** )) رواه إبن ماجه، واتە: ئافرەتانی باش بۆ کۆرپەکانتان هەڵبژێرن‌و هاوسەرانی شایستە بێنن‌و ژنیش بەخەڵکی شایستە بدەن.

٤- ((**عن المغيرة بن شعبة قال: خَطَبْتُ امرَأةً فقال لي النبي ﷺ: أنظرت اليها؟ قلت: لا، قال: أنظر اليها فأنَّه أحْرى أن يُؤْدَم بينكما**)) رواه الترمذي وحَسَّنَه و رواه النسائي، واتە: موغەیرەی کوڕی شوعبە دەڵێ: ئافرەتێکم خواستبوو پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرمووم: تەماشات کردوە؟ گوتم: نا، فەرمووی، تەماشای بکە چونکە ئەوەباشترە بۆهۆگریی‌و پتەوبوونی پەیوەندی نێوانتان.

٥- (( **عن جابر رضي الله عنه قال: تزوجتُ فقال لي رسول الله ﷺ: ماتزوَّجْتَ؟! فقلت: تزوجت ثيِّباً، فقال: فهلاّ جاريةً تُلاعِبُها وتلاعِبَكَ** )) متفق عليه، واتە: جابیر خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ ژنم هێنا، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: کێت هێنا؟ گوتم: بێوەژنێکم هێناوە، فەرمووی: دەبووایە کچێکت هێنابایە گاڵتەت لەگەڵ

كردباو گاڵتەی لەگەڵ كردبای!

٦- **((اذا خطب اليكم مَنْ تَرضَون دينَهُ وخُلُقَهُ فزوِّجوه، إلاّتفعلوا تكُنْ فتنةٌ في الأرض وفسادٌعريض))** رواه الترمذي عن أبي هريرة وصحَّحه، واتە: هەركات كەسێك كەلە دینداریی‌و ڕەوشتی ڕازی بوون خوازبێنی ئافرەتی لێكردن، پێی بدەن، ئەگەر وانەكەن ئاشووب‌و خراپەكارییەكی بەربڵاو لە زەویدا پەیدا دەبێ.

كەواتە:

سەرجەم ڕێنماییەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ كەسانێك كە بەتەمای ژنهێنان‌و خێزان پێكەوەنانن -وەك لە فەرموودەكانی (١-٥)دا دەبینرێ- ئەوەیە، كە هەوڵبدەن ئەو ئافرەتەی دیاری دەكەن بۆژیانی هاوسەرێتییان، ئەم خەسڵەتانەی تێدابن:

**یەكەم: دینداریی:** وەك لە فەرموودەی یەكەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو ئەو چوار خەسڵەتەدا، كە لە ئافرەتدا ڕەچاو دەكرێن بۆ خواستنی، كە سامان‌و خانەدانیی‌و جوانیی‌و دینداریین، جەختی لەسەر چوارەمیان كردۆتەوە.

**دووەم: مێرد دۆستیی:** وەك لە فەرموودەی دووەمدا پێغەمبەری خوا ﷺ ژنی پەسندی بە (الودود) پێناسەكردوە.

**سێیەم: زاوزێكەر:** كە لەهەمان فەرموودەی پێشوودا هاوسەری پەسند بەوشەی (الولود) وەسف كراوە، شایانی باسیشە كەئەم سیفەتەی ئافرەت هەرچەندە پێش شووكردنی نازانرێ، بەڵام دەگونجێ لەڕێی تێوەڕامانی ئافرەتانی خزم‌و نیزیكییەوە بەمەزەننە بزانرێ.

**چوارەم: شایستەو گونجاو:** وەك لە فەرموودەی سێیەمدا ئاماژەی پێكراوە، مەبەستیش لە شایستەیی‌و گونجاویی ئەوەیە، كە لەڕووی ئاستی كۆمەڵایەتیی‌و ژیان‌و گوزەرانەوە هاوئاست‌و هاوكووف بێت.

**پێنجەم: بینراوبێ‌و ناسراوبێت:** وەك لە فەرموودەی چوارەم‌دا باسكراوە، پێشم وایە ڕستەی (انظر اليها) تەنیا بینینی ڕواڵەتی ناگەیەنێ، بەڵكو شارەزابوون‌و پێئاشنابوونیشی دەگەیەنێ، چونكە پاساو دانەوەی ئەو بینرانە بەوە كە دەبێتە مایەی ئولفەت‌و هۆگریی‌و خۆشەویستی (فإنه أَحْرى أن يؤدم بينكما) بە ڕوونیی ئەوەی لێ دەفامرێتەوە .

**شەشەم: كچ بێت و شووی دیكەی نەكردبێ:** وەك فەرموودەی پێنجەم بەڕاشكاویی خستویەتەڕوو.

بەڵام پێویستە بزانرێ كە لە چەند حاڵەتێكدا بێوەژن باشترە، وەك ئەوە كە بێوەژنەكە خزم بێت، یان بێ سەرپەرشت بێت، یان لە كچەكە بەدینتر بێ، یان پیاوەكە منداڵی وردی هەبن‌و...هتد[1] .

هەروەها ئەو فەرموودەیەش كە پێشتر لە (جابر)ەوە هێنامان دەلالەتی لەسەر دەكات، چونكە: لە تەواوكەری فەرموودەكەدا هاتوەكە (جابر) خوا لێی ڕازی بێ كاتێك بۆ پێغەمبەری خوای ڕوون دەكاتەوەو پاساو دێنێتەوە كە هۆی هێنانی بێوەژنەكە لەجیاتی كچێك ئەوەیە كە چەند خوشكێكی بچووكی هەن كە پاش مردنی بابی بەسەریدا بەجێماون‌و ئەویش نەیویستوە كە كچێكی هاوتەمەنیان بەهاوسەر بگرێ، بەڵكو ئافرەتێك بێ سەرپەرشتییان بكات، پێغەمبەر ﷺ هەڵوێستەكەی پەسندكردوە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ ڕێنمایی ئەوكەسانە دەكات، كە خوازبێنی ئافرەتیان لێ دەكرێ، كە سێ مەرجی سەرەكی لەوكەسەدا ڕەچاوبكەن، كە خزمایەتی لەگەڵ دەكەن:

یەكەم: لە دینداریی‌و مسوڵمانەتیی ڕازی بن.

دووەم: لە ڕەوشت‌و خووی ڕازی بن، وەك لە فەرموودەی شەشەم‌دا هاتوە.

---

١) بڕوانە: (المفصّل في أحكـام المرأة والبيت المسلم) د.عبدالكريم زيدان، ج٦، ص٤٨-٤٩.

سـێیەم: شایستەو گونجاوبێ، وەك لە فەرموودەی سێیەمدا هاتوە.

شتێكی ئاشكراو ڕوونیشە كە وەك چۆن پیاوێك، كە نیازی هاوسەرگیریی هەیـە لەگەڵ ئافرەتێكدا بۆی هەیـە هـەوڵی بینینـیو ناسـینیو پـێ ئاشـنابوونی –لـە سنووری شەرعدا- بـدات، ئـافرەتیش هـەمان مـافی هەیـە، هـەروەها وەك چـۆن جوانییو ماڵو سامانو خانەدانەیی لە ئافرەتاندا وێـڕای دینـداریی و خووڕەوشـتی جوان، جێی سەرنجی پیاوانن، ئافرەتانیش هەروانو هەمان ئـەو مافـەی، كـە پیـاو هەیەتی لەوبارەوە ئافرەتیش هەیەتی، وەك شەرعزانان باسـیان كـردووەو ڕسـتەی: ﴿... وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ...﴿٢٢٨﴾ البقرة﴾یش دەیگەیـەنێ، واتـە: وە ئافرەتان مافیان بەسەر پیاوانەوە هەیە وەك چۆن ئەركیان لەسەرشانە بەشـێوەیەكی پەسندو باش.

هەربۆیەش لە (عبدالله بن العباس)ەوە -خوا لێی ڕازی بێ- گێڕراوەتـەوە، كـە گوتوویەتی: ((إنيِّ لأَحِبُّ أنْ أتَزَيَّنَ للمـرأة كمـا أَحِـبُ أن تتـزيَين لـي المـرأة، لأنَ الله تعالى يقول: ﴿...وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ...﴾)) رواه ابن جريـر وابـن أبـي حاتم[1]، واتە: من حەزدەكەم خۆم بۆژن بڕازێنمەوە وەك چۆن حەزدەكەم ژن خۆیم بۆ بڕازێنێتەوە، چونكە خوای بـەرز دەفـەرموێ: وەئافرەتـان مافیـان بەسـەرپیاوانەوە هەیە وەك چۆن ئەركیان لەسەرشانە بەشێوەیەكی پەسندوباش.

هیچ گومانیشی تێدانیە، كە هـەركاتێك لـە پرۆسـەی هاوسـەرگیریی و خێـزان پێكەوەناندا ئەو ڕێنماییانە لەلایەن هەركام لە پیاوو ئـافرەتو كـەسو كاریانـەوە ڕەچاوكران، ئەوە ئەوخێزانە بناغەیەكی پتەوو مەحكەمی مەعنـەویی دەبـێو، لـە بەرانبەر ئەو گرفتو كێشانەدا، كە هیچ خێزانێك بەتایبەت لە سەرەتاوە كـەمو زۆر لێیان سەلامەت نابێ، خۆگرو دامەزراوو نەلەخشاو دەبێ.

---

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثيـر)، ص١٦٦.

## پێنج: ئەركەكانی ژن‌و مێرد لە جوغزی ماڵ‌و خێزان دا، لەبەر ڕۆشنایی پێكهاتەی سروشتیان دا دیاریكراون:

بەڵێ لە شەریعەتی خوای كاربەجێدا ئەركەكانی هەركام لە ژن‌و مێرد لەجوغزی ماڵ‌و خێزاندا بە لەبەرچاو گرتنی پێكهاتەی سروشتیی هەركامێكیان بە رووح‌و جەستەو عەقڵەوە، دیاری كراون، كە پێشتر تیشكمان خستە سەریان‌و لێرەدا بەپێویستی نازانم دووبارەیان بكەینەوە، بەڵام بەپێویستی دەزانم ئاماژەیەكی كورت بۆ دوو مەسەلان بكەم:

١- ئەوانەی كە بەچاوی بەكەمدانان سەیری ئەركی سەرەكی‌و خوارسكی ژن دەكەن، لە جوغزی ماڵ‌وخێزاندا، كە بریتیە لە كابانێتی‌و ماڵداریی‌و دایكایەتی‌و منداڵ بەخێوكردن! پێویستە بەجددیی چاو بەو بیروبۆچوونەی خۆیاندا بگێڕنەوە، چونكە ئەو بیركردنەوەیە وێڕای ناواقیعی‌و نامەنتیقی بوونی، دژو پێچەوانەی ماف‌و بەرژەوەندیی منداڵ‌و خێزان‌و كۆمەڵگاشە، كێش دەیەوێ بەچاوی سەر بەرو بەرهەمی ژەقنەمووت ئاسای ئەو بیرۆكەیە ببینێ، باسەرنجێكی واقیعی خێزانیی‌و كۆمەڵایەتی ئەو وڵاتانە بدات كە ئەركی ماڵداریی‌و دایكایەتییان لەلای ژنان كردۆتە شتێكی بەكەم سەیركراو، تابزانێ چۆن ڕێژەی منداڵی زۆڵ‌و تەڵاق‌و نەخۆشییە جینسییەكان‌و دەردو نەهامەتییەكانیان، ڕۆژ بۆ ڕۆژی لەزیاد بوون دایە!

٢- هەركام لە ئافرەت‌و پیاو وێڕای ئەركە سروشتییەكانیان لە چوارچێوەی ماڵ‌و خێزاندا، چەندان ئەرك‌و كاری دیكەی جیاوازو هاوبەشیشیان هەن لە چوارچێوەی كۆمەڵگاداو، هەركەسێك پێی وابێ كە ئیسلام ڕێی لە ئافرەت گرتوە كە لە دەرەوەی جوغزی ماڵ‌و خێزاندا ڕۆڵی خۆی بگێڕێ، خراپ بەهەڵەدا چووە،وەك بەدرێژیی لە كتێبی، (ئافرەت‌و خێزان لەسایەی

شەریعەتدا)[١] باسمان كردووەو، ئەم ئایەتەش كە پێشتریش هێناومانە، چاكترین بەڵگەیە لەوبارەوە، كە خوای كاربەجێ لە پێناسەی پیاوان‌و ئافرەتانی بڕوادارو ئەركەكانی سەرشانیاندا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٧١ ﴾ التوبة.

كەواتە:

هەركام لە پیاوان‌و ئافرەتان پێویستە هاوكارو پشتیوان‌و دەستبارگری یەكدی بن لە چوارچێوەی كۆمەڵگادا بۆ:

١- فەرمان كردن بە چاكە.
٢- ڕێگریی كردن لە خراپە.
٣- نوێژ بەرپاكردن.
٤- زەكات دان.
٥- فەرمانبەریی كردنی خوا عزّوجلّ.
٦- فەرمانبەریی كردنی پێغەمبەری خوا ﷺ.

شایانی باسیشە كە هەركام لە وشەی (المعروف)و (المنكر) كە ئەلیف‌و لامی (تعریف)یان لەسەرە، سەرجەم جۆرو تاكەكانی چاكەو خراپە دەگرنەوە، لە هەموو بوارەكانی فیكریی‌و عەقیدەیی‌و سیاسیی‌و ئابووریی‌و كۆمەڵایەتی‌و...هتددا.

نوێژو زەكاتیش دوو پایەو درووشمی مەعنەویی‌و مادیی هەرە گەورەی تاك‌و

---

١) بڕوانە: بەشی دووەم، كەسایەتی‌و ڕێزوپایەی ئافرەت لە سایەی شەریعەتدا. ل (٩٥-١٦٢)، چاپی دووەم.

کۆمەڵگای مسولمانن‌و فەرمانبەریی کردنی خواش لەپابەندیی بەقورئانداو هی پێغەمبەریش لەپابەندیی بەسوننەتدا خۆیان دەنوێنن، کەواتە: ئەم شەش ئەرکەی کە خوای بەرزومەزن لەسەر هەردوو ڕەگەزی نێرومێی کۆمەڵگای ئیسلامیی پێویست کردوون، کە بۆ ئەنجامدانیان پێکەوە هاوکارو پشتیوان بن، تێکڕای شەریعەت دەگرنەوە.

## شەش: پیاو سەرپەرشتیارەو ژن لە سنووری شەرع دا گوێڕایەڵیەتی و بە ڕاوێژ کاروباری ماڵ بەڕێوە دەبەن:

یەکی دیکە لە پایەو بنەڕەتەکانی خێزان لە ئیسلامدا، ئەوەیە کە پیاو مشوورخۆرو سەرپەرشتیارەو ژنیش فەرمانبەروگوێڕایەڵی مێردیەتی لەسنووری شەریعەتداو هەردووکیشیان پێکەوەو بەڕاوێژ کاروباری ماڵو خێزان بەڕێوەدەبەن، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٞ لِّلۡغَيۡبِ ...﴿٣٤﴾ النساء﴾، واتە: پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر ژنانەوە لە سۆنگەی ئەوەوە، کە خوا هەندێکیانی بەسەر هەندێکیاندا پەسند کردوە، وە بەهۆی ئەوەوە کە (پیاوان) سامانی خۆیانیان (بۆ ژنەکانیان) خەرج دەکەن، جا ژنانی چاك گوێڕایەڵن (بۆ مێردەکانیان) وە بەهۆی ئەوەوە، کە خوا مافەکانیانی پاراستوە ئەوانیش پارێزەری (کەرامەت‌و سامانی) مێردەکانیانن لەکاتی لە ماڵ نەبوونیاندا.

بەڵگەی ئەوەش کە پێویستە ژن‌ومێرد بەڕاوێژو هاوکاری نێوانیان کاروباری ماڵو خێزان بەڕێوە ببەن، ئەوەیە کە خوا سبحانەو تعالی لەبارەی کۆمەڵو کۆمەڵگای بڕوادارەوە بەگشتی فەرموویەتی: ﴿...وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ...﴿٣٨﴾ الشورى﴾، واتە وە کاروبار بەڕێوەبردنیان لەنێوانیاندا بە ڕاوێژە.

ئاشکراشە کە چەمكو واتای ئەم ڕستە قورئانییە، وێڕای کۆمەڵگا، خێزان (أسرة)یش دەگرێتەوە، چونکە ئایەتەکە بەگشتی باسی مسوڵمانان دەکاتو، دیارە خێزانیش کۆمەڵگایەکی گچکەیەو کۆمەڵگاش خێزانێکی گەورەیە.

بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە، کە خوای بێ وێنە لە سیاقێکدا کە باسی شیرپێدان (رضاع)و لە شیر بڕینەوە(فطام)ی منداڵ دەکات، فەرموویەتی: ﴿... فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا ...﴾(٢٣٣) البقرة﴾، واتە: جا ئەگەر دایكو باب بە ڕەزامەندیی‌و ڕاوێژی خۆیان ویستیان لە شیری ببڕنەوە گوناهیان ناگات.

دەجا بێگومان وەك چۆن دیاری کردنی ماوەی شیر پێدانو لەشیر بڕینەوەی منداڵ پێویستی بە لەیەك گەیشتنو ڕاوێژ پێکەوەکردنی ژنو مێردهەیە، سەرجەم کاروبارەکانی دیکەش بەهەمان شێوە.

ئنجا ئەگەر یەکێکیش پرسیار بکات:

بۆچی پیاو سەرپەرشتیاری ژنو ماڵ بێ نەك بە پێچەوانەوە، وە ئایا ناگونجێ کە هیچ کامیان سەرپەرشتیارنەبن؟!

لە وەڵامدا دەڵێین:

جارێ ئەوە کەماڵو خێزان هیچ سەرپەرشتیارێکی دیاریکراوی نەبێ، شتێکی بێ ماناو نەگونجاوە، چونکە وەك چۆن وڵات بەبێ حوکمڕان بەڕێوەناچێ، هەروەها هیچ فەرمانگەیەك نیە کە بەڕێوەبەر (مُدیر)ێکی نەبێ، ماڵو خێزانیش بەهەمان شێوە پێویستی بەحوکمڕانو بەرپرسو مشوور خۆرێك هەیە، ئەگەرنا وەك هەرشتێکی دیکە سەرپەرشتیارو بەرپرس نادیار زایەدەبێو تێکدەچێ.

بەڵام ئەوە کە بۆچی پیاو سەرپەرشتیارە نەك ژن؟ ئەوە وەڵامەکەی هەر لەخودی ئایەتەکەدا هەیە، چونکە خوای کاربەجێ سەرپەرشتارییەتی پیاوانی بۆ ژنان -

لەجوغزی خێزانو ماڵدا- بـەوە پاسـاو داوەتـەوە كـە هـەركام لـە پیـاوانو ژنـان ئیمتیازو پەسندیی (فضل)یان بەسەر یەكدا هەیەو، پیاوان لە ماڵو سامانی خۆیان بۆ ژنـەكانیانو خێزانیـان خـەرج دەكـەن: ﴿...بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ ...﴾ ﴿٣٤﴾ ﴿النساء﴾، جا ئێمە پێشتر باسی چەمكو واتای ڕاسـتو ڕوونـی ڕسـتەی: ﴿بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾مـان كـردو لێـرە دووبارەی ناكەینەوە، ئەوەندە دەڵێیـن: كە خوای زاناو شارەزا بەم ڕسـتەیە كـە لـە سیاقی پاساودانەوەی سەرپەرشتیارێتی پیاودا بۆ ژنو ماڵ فەرموویـەتی، دەیـەوێ تێمان بگەیەنێ كە ئەوە تایبەتمەندییەكانی هەركام لە پیاوانو ژنانن، كە واپێویست دەكەن پیاو سەرپەرشتیارو مشوورخۆرو چاودێری ژنو منداڵ بێتو، ژنـیش وێـڕای بەرپرسیارێتی گشتی بەرانبەر بەماڵو مێردی، بەقسەی مێردی بكاتو گوێڕایـەڵی بێت.

كەواتە: پاساوی یەكـەمی سەرپەرشـتیارێتی پیـاو بـۆ ژن، لـە جـوغزی مـاڵو خێزاندا، بریتیە لەوە كە لەڕووی پێكهاتەی سروشتییەوە پیاو شیاوترە بۆئەوەی ئەم ئەركو بەرپرسیارێتییەی پێ بدرێ، كە لەڕاسـتیدا بـارو تەكلیفـە نـەك خـەڵاتو تەشریف! وەپاساوی دووەمیش بریتیە لە خەرجكرانی ماڵو سامان لەلایەن پیاوەوە بۆ ژنو ماڵ، كە هەم لە مارەیی (مهـر)و هـەم لـە مەسرەفكێـشانو دابینكردنـی سەرجەم پێداویستیەكانی ژیانو گوزەراندا خۆی دەنوێنێ.

ئاشكراشە كە هەردووك پاساوەكە زۆر مەنتیقیو بەجێن، چونكە:

یەكـەم: ئەگـەر بـەراوردێكی خێـرای نێـوان جەسـتەی پیـاوو ژن بكـەین، بۆمـان دەردەكەوێ كە سـپێررانی ئـەركی سەرپەرشـتیارێتی ژنو مـاڵو دابینكردنـی پێداویستییەكانی ژیانو گوزەرانی خێزان، بەپیاو، وەك هەر یاسایەكی دیكـەی شەریعەتی خوای كاربەجێ، شتێكی یەكجار بەجێو پڕ بەپێستە:

١- پەیكەری ئێسكیی (الهيكل العَظمي) پیاو بەگشتی لە هی ژن درێژترەو ئێسكەكانی پیاو لەهی ژن قەبەترو پتەوترن.

٢- ڕۆیشتنی پیاوو ئافرەت لەیەك جیان، هەرچی پیاوە هەنگاوەكانی فراوانن‌و بە ڕێكی دەڕوات، بەڵام ئافرەت هەنگاوەكانی وردن‌و جۆرێك لە لەنجەو لاریش لە ڕۆیشتنی‌دا هەیە، بەهۆی شێوەی پێكهاتەی جەستەیەوە.

٣- دەنگی پیاو بەهێزو گڕەو هی ئافرەت نەرم‌و ناسك‌و كپە.

٤- پێستی پیاو لەهی ئافرەت بەهێزترو زبرترە.

٥- كەللەی سەری پیاو لەهی ئافرەت گەورەترو قورسترە.

٦- ددانەكانی ئافرەت لەهی پیاو وردترن.

٧- سینگی ئافرەت لەهی پیاو كورتترو كەمبەرترە لەلای خوارەوەی، هەربۆیەش ئافرەت كەلەكەی (خصر)ی باریك دەردەكەوێ.

٨- ڕێژەی چەوری (نسبة الدهن) لە جەستەی ئافرەت‌دا لەهی پیاو زیاترە، هی ئافرەت بەگشتی (٢,٢٨٪) بەڵام هی پیاو بەگشتی (٢,١٨٪)یە، هەربۆیەش جەستەی پیاوان پتەوترو ماسوولكەدارترو بۆ سەرماو گەرماش خۆڕاگرترە لە هی ئافرەتان‌و، بەپێچەوانەوە جەستەی ئافرەتان نەرم‌و ناسكترو بێ‌هێزترەو، لەمەشەوە ئافرەت نازناوی: ڕەگەزی ناسك (الجنس اللَّطيف)ی وەرگرتوە.

٩- دڵی پیاو بەگشتی لەهی ئافرەت گەورەترەو قورسترە، چونكە دڵی پیاوان لەنێوان (٢٨٠) تا (٣٤٠) گڕام دایە، بەڵام هی ئافرەت لەنێوان (٢٣٠) تا (٢٨٠) گڕام دایە.

١٠- ئنجا جیاوازی نێوان پیاوو ئافرەت لەڕووی كۆئەندامی زاووزێ‌و كەوتنە حەیزی ئافرەتان‌و ئاوس بوون‌و مندالبوونیان‌و شیر پێدانی كۆرپەو...هتد، لەوە ئاشكراترن، كە لە ئاماژە پێكردن زیاتریان پێویست بێ[1]!

---

١- بڕوانە: (فنّ احتواء المشكلات الزوجية)، ج١، ص(٩٢،٩٣) المستشار الأُسري: أ. محمد المحرزي، كە

دیاره جیاوازییه‌كانی نێوان پیاوو ئافره‌تیش ته‌نیا جه‌سته‌یی‌و ڕواڵه‌تیی نین، وه‌ك پێشتریش باسمان كردوه، وه له‌ڕووی جه‌سته‌ییشه‌وه ته‌نیا ئه‌و شتانه نین كه باسمان كردن، به‌ڵكو وه‌ك پێشتر له زانای ناودار (ئه‌لكسیس كاریل)ه‌وه نه‌قڵمان كرد جیاوازی نێوان پیاوو ئافره‌ت شتێكی قووڵ‌و ڕیشه‌داره، كه له خودی نێرایه‌تی (ذكورة)و مێیایه‌تی (أنوثة)یانه‌وه سه‌رچاوه‌ی گرتوه.

كه‌واته:

ئایا شه‌ریعه‌تی خوای به‌به‌زه‌یی‌و كاربه‌جێ بڕیارێكی یه‌كجار مه‌نتیقی‌و پڕ به پێستی نه‌داوه، كه ئه‌ركی سه‌رپه‌رشتیارێتی ژن‌و ماڵ‌و دابینكردنی پێداویستییه‌كانی ژیان‌و گوزه‌رانی خێزانی به‌پیاو سپاردوه، كه بێگومان ئه‌و ئه‌ركه په‌كی له‌سه‌ر جه‌سته‌یه‌كی زبرو به‌هێزو پته‌و كه‌وتوه، كه بتوانێ ته‌حه‌مولی سه‌ختیی‌و گرفتارییه‌كانی مه‌یدانی بژیو په‌یداكردن‌و ماڵ‌وحاڵ به‌ڕێوه‌بردن بكات؟! بێگومان با.

دووه‌م: مادام شه‌ریعه‌ت له‌سه‌ر پیاوی پێویست كردوه، كه خه‌رجیی‌و مه‌سره‌فی خۆی‌و ژن‌و منداڵی دابین بكات، ئه‌ویش له‌سۆنگه‌ی ئه‌وه‌وه كه‌ئه‌م ئه‌ركه زیاتر به‌و جێبه‌جێ ده‌كرێ، بۆیه شتێكی سروشتی‌و چاوه‌ڕوان كراویشه كه هه‌رئه‌ویش ئه‌ركی سه‌رپه‌رشتی كردن‌و به‌ڕێوه‌بردنی ئه‌و ژن‌و ماڵه‌ی پێ بسپێررێ كه خۆی مه‌سره‌فیان ده‌كێشێ.

چونكه هیچ ماقووڵ نیه كه‌سێك پاره‌و بژیو په‌یدا بكات‌و یه‌كی دیكه بكرێته به‌رپرس‌و سه‌رپه‌رشتیاری!

ئنجا پێشینانیش گوتوویانه: (ئه‌وه‌ی ده‌كا ده‌زانێ ئه‌وه‌ی ده‌خوات چووزانێ!) دیاره پیاویش، كه ڕه‌نج‌و ته‌قه‌للای بژیو په‌یداكردن ده‌دات، له ژن باشتر ده‌زانێ بژێوو ماڵ‌و سامان په‌یداكردن چ زه‌حمه‌تێكی ده‌وێ، وه‌زیاتر به‌ته‌نگ ماڵ‌و

---

ئه‌ویش له كتێبی (الرجال من المریخ، النساء من الزهرة)ی دكتۆر جۆن كیری، وه‌ری گرتوه.

سامانەكەیەوە دەبێ‌و، خۆی لە زێدەڕۆیی (إسراف) دەپارێزێ .

لە كۆتایی ئەم باسەشــدا دەڵێیــن:

بێگومان سەرپەرشتیارێتی (قِوامـة) پیاو بەسەر ژنــەوە بــەمانای كوێخایــەتی‌و دیكتاتۆریی پیاو نیە، بەڵكو مەبەست لەسەرپەرشتیارێتی پیــاو، مــشوورخواردن‌و چــاودێریی كــردن‌و بەســەر ڕاگەیــشتنیەتی بــۆ ژن‌و منداڵــەكانی، كــە لــە ڕووی دڵسۆزیی‌و بەزەیی‌و پەرۆش‌و هەستكردن بە بەرپرسیارێتیی‌یــەوە، بــەپێ‌ی توانــای خــۆی كەمتەرخــەمی نــەكات لــە بــەڕێوەبردنی كاروباریــان‌و دابینكردنــی پێداویــستییەكانیان‌و چارەســەركردنی گرفــت‌و كێــشەكانیاندا، چــونكە وشــەی (قَوّامون) كۆی (قوّام)ە‌و ئەمیش ڕێژگەی داكۆكیكردنی (صـیغة المبالغـة)ی وشــەی (قائم)ە، (قائم)یش (إسم الفاعل)ی (قامَ)یە، دەگوترێ: (قامَ بالأمر) واتە: كارەكەی هەڵسووڕاندو جێبەجێ كرد، كەواتە: (الرجال قَوّامون على النساء) یـانی: پیــاوان زۆر سەرپەرشتیاری ژنــانن، واتــە: زۆر بــە جــەخت كردنــەوە مــشووریان دەخــۆن‌و خزمەتیان دەكەن‌و كاروباریان بەڕێوە دەبەن.

ئاشكراشە كە بەرپرسیارێتی پیاو بەرانبەر بەژن‌و ماڵی‌و سەرپەرشتیار بــوونی، مانای ئەوەنیە كە ژن هیچ ڕۆڵێكی نیە لە مشوور خــواردن‌و سەرپەرشــتیارێتی‌دا، بەڵكو ئەویش هەربەر پرسیارە‌و پێویستە ژن‌و مێــرد پێكــەوە‌و بەڕاوێــژ كاروبــاری ماڵ‌و خێزان بەڕێوە ببەن، ئەوەندە هەیە قسەو بڕیاری كۆتایی هی پیاوە‌و پێویــستە ژن فەرمانبەریی مێردی بكات، وەك چۆن لەسەر پیــاو پێویــستە ڕاوێــژ بەژنەكــەی بكات‌و بەشێوەیەكی پەسندو باش ڕەفتاری لەگەڵ بكات، وەك لــەخاڵی داهــاتوودا باسی دەكەین، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی بەرپرسیارێتی ژن بەرانبەر بــە مــاڵ‌و مێردی فەرموویەتی: (( **كلكم راعٍ وكلكم مسئول عن رعيَّته ... والمرأة راعية على بيت زوجها وولَدِهِ** )) متفق عليه، واتە: هەركامێكتان چــاودێرە‌و هــەر كامێكتــان بەرانبــەر بــە كۆمەڵگایەكــەی بەرپرســیارە... وە ژن بەســەر مــاڵی مێردەكــەی‌و منداڵەكانییەوە چاودێرە.

## حەوت: ژن و مێرد پێویستە بەچاکترین شێوە پێکەوە ڕەفتار بکەن و، بۆ چارەسەری گرفت و کێشەش پێنج ڕێیان لەپێشن و لەکاتی گەیشتنە بنبەستیش دا پیاو تەڵاق و ژن داڕنین (خُلْع)ی بۆ هەیە:

وەك پێشتر باسمان کرد بناغە لەژیانی ژن و مێردایەتی‌دا بریتییە لە بەزەیی و ڕێزوخۆشەویستی دووسەرەو دڵی یەکدی ڕاگرتن و پێکەوە ڕاوێژو هاوکاری کردن.

دیارە لە بواری هەڵس‌وکەوتی نێوان ژن و مێردیشدا، پێویستە مێرد دەستپێشخەری چاکەو جوامێریی و خۆشڕەفتاریی بێت و لە بەرانبەر هەڵەو کەم‌وکورییەکانی ژندا لێبوردەو سینگ فراوان و بەخشندە بێت، ئەم ڕاستییەش زۆر جوان لەم ئایەت و فەرمایشتانەدا دەدرەوشێتەوە:

١- خوای بەبەزەیی پیاوانی دواندوەو پێی فەرموون: ﴿... وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ النساء﴾، واتە: وە-ئەی پیاوینە!- بە شێوەیەکی پەسند مامەڵەیان لەگەڵ بکەن (واتە: لەگەڵ ژنەکانتان) وە ئەگەر (لەبەر خەسڵەتێکی خراپ) ڕقتان لێیان بۆوە، نزیکە شتێکتان بەدڵ نەبێ و خواش خێرێکی زۆری تێبخات.

٢- پێغەمبەریش ﷺ هەر لەوبارەوە ڕوو بە پیاوان فەرموویەتی: (( **لا يَفْرَكْ مؤمِنٌ مَؤْمِنةً، إنْ سَخِطَ منها خُلُقاً رضي منها آخر** ))، رواه مسلم، واتە: با هیچ پیاوێکی بڕوادار ژنێکی بڕوادار نەبوغزێنێ، چونکە ئەگەر لە خەسڵەتێکیشی نارازی بێ، خەسڵەتێکی باشی هەیە پەسندی بکات.

٣- هەروەها فەرموویەتی: (( **خيركم خيركم لأَهلِهِ وأنا خيركم لأَهْلي** ))، رواه الترمذي، واتە: چاکترینتان باشترینتانە بۆ هاوسەری و منیش لە هەمووتان بۆ هاوسەرم باشترم.

بەڵام بێگومان مەل بەباڵێك نافڕێو چەپڵە بەدەستێك لێنادرێو، ژنیش لە بەرانبەردا لەسەری پێویستە، كە لەگەڵ مێردیدا خۆش ڕەفتار بێو، ڕێزی لێبگرێو، لە سنوری شەرعدا بەقسەی بكات، وەك خوای كاربەجێ لەپێناسەی ژنانی چاكو دینداردا فەرموویەتی: ﴿فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ ...﴿٣٤﴾ النساء﴾، كە پێشتر مانامان كردوە، پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (( **خير النساء آمرأةٌ إذا نَظَرْتَ اليها سَرَّتْكَ، واذا أمَرْتَها أطاعَتْك، وإذا غِبْتَ عنها حَفِظَتْكَ في نفسها ومالك** )) رواه الطبري وأورده ابن كثير في تفسيره[1]، واتە: چاكترین ئافرەت ژنێكە هەركات تەماشات كرد دڵخۆشت بكات، وە كە فەرمانت پێكرد بەقسەت بكات، وە ئەگەر لە ماڵ نەبووی لەخۆیو ماڵو سامانت دا بتپارێزێ.

بەڵێ پێویستە ژنو مێرد هەتا دەتوانن پێكەوە خۆش ڕەفتارو چاكەكاربن، بەڵام بێگومان ژنو مێرد بەحوكمی جیاوازی پێكهاتەی سروشتیان گرفتو تێكگیرانیان لەنێواندا هەردەبێ، هەربۆیەش شەریعەتی خوای زاناو شارەزا ئەو ڕاستییەی ڕەچاو كردوەو سێ جۆرە ڕێی خستۆتە بەردەم پیاو- بەحوكمی ئەوەی كە سەرپەرشتیارو مشوورخۆری خێزانە- بۆئەوەی چارەسەری ئەو گرفتو كێشانە بكات كە لەنێوان خۆیو ژنەكەیدا سەرهەڵدەدەن، هەروەها ڕێیەكیشی خستۆتە بەردەم ژنو ڕێیەكیشی بۆ خزمو كەسو كاری هەردووك لایان داناوە، جا ئێمە دوای كەمێكی دیكە بەڕیزو پلەپلە باسیان دەكەن، بەڵام بەرلەوە بەپێویستی دەزانم ڕاستییەكی گرنگ لەبارەی تێكگیرانو گرفتو كێشەی نێوان ژنو مێردەوە بخەمەڕوو:

پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەند فەرمایشتێكیدا فەرمانی بەپیاوان كردوە، كە لەگەڵ ژنەكانیاندا باش بنو چاوپۆشییان لێبكەن، پاشان ئەو لەگەڵ چاكبوونو چاوپۆشییەی بەوە پاساو داوەتەوە، كە ئافرەت لە پەراسوو (ضِلَعْ) دروستبووە، یان

---

١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص٢٩٠.

وەك پەراسوو وایە، کە یەکێك لە فەرمایشتەکان ئەمەیە:

**(( استوصوا بالنساءِ خيراً، فأن المرأة خُلِقَتْ من ضِلَعٍ وانَّ أَعْوَج ما في الضِّلَعِ أعلاه ُ، فأن ذهَبْت تُقيمهُ كَسَرْتَه، وانْ تركته لم يَزَلْ أعوج، فآستوصوا بالنساءِ ))** متفق عليه، واتە: ئامۆژگارییتان دەکەم کە چاکە لەگەڵ ژناندا بکەن، چونکە ئافرەت لەشێوەی پەراسوودا دروستکراوە، پەراسووش لای سەرەوەی لە هەمووی خوارترە، جا ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیەوە دەیشکێنی، وەئەگەر لێی بگەڕێی هەر بە خواری دەمێنێتەوە، دەجا ئامۆژگاریتان دەکەم کە لەگەڵ ژناندا باش بن.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونکردنەوەی ئەوە بووە، کە وەك چۆن پەراسوو خوار دروستکراوەو ناشگونجێ ڕاستی بکەیەوە مەگەر بیشکێنی، ئافرەتیش لەورووەوە لە شێوەی پەراسووی لار دایەو پێویستە وەك خۆی قبووڵمان بێت، نەك هەوڵ بدەین بیهێنینە سەر سروشتو میزاجی پیاوانەی خۆمانو، بەحیسابی خۆمان ڕاستی بکەینەوە، کەواتە: ئەوانەی کە بەهەڵە وا لەوجۆرە فەرمایشتانە حاڵی بوون، کە مەبەست پێیان هەوالّدانی پێغەمبەرە ﷺ بەچۆنیەتی دروستبوونی ئافرەت پێویستە چاو بەخۆیاندا بگێڕنەوە، وە ڕیوایەتێکی دیکەی ئەو فەرموودەیەی لەسەرێ هێنامان ئەو مەبەستەی گوتمان بەڕوونی ڕادەگەیەنێ، کە دەفەرموێ: **(( المرأة كالضِّلَع إنْ أَقَمْتَهَا كَسَرْتَها وان آستمتعت بها آستمعت بها وفيها عِوَجٍ ))** متفق عليه، واتە: ژن وەك پەراسوویە، ئەگەر ڕاستی بکەیەوە دەیشکێنی، وەئەگەر لێی بەهرەمەندبی، هەر بەلاری لێی بەهرەمەند دەبی.

جا لێرەدا دەپرسین؟:

ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێچواندن (تشبیە)ی ژنان بەپەراسووی خواردا مەبەستی چیە؟ ئایا وەك هەندێك کەس لێی تێگەیشتون بەکەم سەیر کردنی ژنە یان شتێکی دیکەیە!؟

لە وەڵامدا دەڵێیـــن:

لەڕاستیدا جگە لەگومانی خراپ بردن (سَؤ الظنِّ)، ئـەوجۆرە تێگەیـشتنە لـەو فەرموودەیە هیچ بنەمایەکی دیکەی نیەو، مانای ڕاستو دروستی ئەو فەرمایشتە هەرئەوەیە، کە پێغەمبەر ﷺ لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئافرەت لە چاو پیـاو، خـوای کاربەجێ سۆزو بەزەیی زیاتری داوەتێ، چونکە ئەرکە سروشـتییو خوارِسـکەکانی ئەوە دەخوازن، جا لە ئەنجامی بەهێزیی سۆزو بەزەییەوە لە چاوی پیـاودا، جۆرێـك لەلارییو لاسەنگی بەهەندێك هەڵوێستو ڕەفتارییەوە دەبینرێ.

ئنجا هەربۆیەش، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بـەپیاوان ڕادەگەیـەنێ کـە ئەگـەر بیانەوێ ژنەکانیان لەدەست نەدەن، بەهۆی جیـابوو نـەوەوە -چـونکە لـە هەنـدێك فەرموودان‌دا هاتوە: (وكسْرُها طلاقهـا) واتــە: وەشـکاندنی تەڵاقدانیـەتی-، ئـەوە پێویستە تەحەمولی ئەو تایبەتمەندییەیان بکەن، کە لەچـاوی ئـەوان‌داو بـەلۆژێکی پیاوانەی ئەوان، لاریـیو خوارییـە، ئەگـەرنا بۆخۆیـانو ئەرکـە خوارِسـکەکانیان، شتێکی پێویستو ڕاستو دروستە[١]! چونکە:

وەك چۆن ئەگەر پەراسووەکانی سینە خــوار نـەبن، ناگونجـێ قەفـەزەی سـینگ دروست بکەنو، جەرگو دڵو هـەناوی مرۆڤـــ لـەنێو خۆیـان بگـرنو بیانپـارێزن، بەهەمان شێوەش ژنیش بەحوکمی ئەو زێدە سۆزو بەزەییو پەرۆشەی، بۆی دەلـوێ کە ئەرکە خوارِسكو سروشتییەکانی جێبەجێ بکات، کە پێش عـەقڵو بیرکردنـەوە پەکیان لەسەر سۆزو بەزەییەکی زێدە کەوتوە، وە ســەرەنجام کۆرپــە بـەخێو بکـات وەچەی نوێ پێبگەیەنێ کە هەناوی کۆمەڵگایە! ئێستاش بـا سـەرنجی ئـەو پێـنج ڕێبازو شێوازە بدەین، کە شەریعەت خستووینە بەردەستی ژنو مێـردو خزمانیـان، بۆ چارەسەری ئەو کێشەو گرفتانەی کە لەنێوانیان‌دا سـەرهەڵدەدەن، کـە سـەرجەم سێ جۆرن:

---

١) شایانی باسە (بخاري) ئەو فەرموودەیەی لەژێر ناوونیشانی: (باب المداراة مع النساء)داو (المسلم) لەژێر ناوونیشانی: (باب الوصية بالنساء)دا، هێناوە.

جۆری یەکەم: چارەسەری ئەو گیروگرفتانەی کە لەنێوان ژنو مێرددا پەیدا دەبن، بەهۆی یاخیبوونی ژنەوە، کە بریتیە لە سێ شێوازی پلەپلەیی لەبەردەم پیاودا.

جۆری دووەم: چارەسەری ئەو گیرو گرفتانەی کە بەهۆی یاخیبوونی پیاوەوە لەنێوان ژنو مێرددا سەر هەڵدەدەن، کە بریتیە لە شێوازێك لەبەردەم ژندا.

جۆری سێیەم: چارەسەری ئەو ناكۆكییەی کە دەکەوێتە نێوانم ژنو مێردەوە، لەلایەن خزمو کەسی هەردوولایانەوە کە بریتیە لە شێوازی پێنجەمو کۆتایی.

## جۆری یەکەم: شێوازی: ١و٢و٣: ئامۆژگاریی کردن، سەرجێی نەکردن، لێدان:

خوای کاربەجێ دەربارەی ئەم سێ شێوازو ڕێبازەی چارەسەرکردنی گیروگرفتی نێوان ژنو مێرد، مادام خەتا لە ژنەوەبێ، فەرموویەتی: ﴿... وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴿٣٤﴾ النساء﴾، واتە: وە ئەو (ژنان)نەی مەترسی یاخیبوونیانتان هەیە ئامۆژگارییان بکەن، وەخۆتانیان لێ دوور بگرن (سەر جێییان مەکەن)، وە (ئەگەر هەر لەسەر یاخییبوون سووربوون) لێیان بدەن، جا ئەگەر گوێڕایەڵێتانییان کرد، بیانوویان پێمەگرن، چونکە بێگومان خوا بەرزو گەورەیە (واتە: ئەگەر بە ناهەق تێیان هەڵپێچنو بیانوویان پێبگرن، ئەوە خوا بەرزو گەورەیەو تۆڵەتان لێدەستێنێ).

جا ئێمە لەبارەی ئەم سێ شێوازەی چارەسەرکردنی یاخیبوونو سەرەڕۆیی ژن، لە بەرانبەر مێردیدا، پێویستە چەند ڕاستییەکمان لەبەرچاو بن:

یەکەم: زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ڕەچاوکردنی پلە پلەییو ڕیز بەندیی (التدّرج والترتیب) لە جێبەجێنەکردنو گرتنەبەری ئەو سێ شێوازو ڕێبازەدا، پێویستە، واتە: دروست نیە مێرد شێوازی دووەم: سەرجێینەکردن

(هَجْر) لەگەڵ ژنەكەیدا لەكاتی یاخیبوونیدا بەكاربێنێ، مەگەر پێشتر شێوازی یەكەم: ئامۆژگاریی (وَعْظ)ی لەگەڵ بەكارهێنابێو دادی نەدابێ، هەروەها دروست نیە شێوازی سێیەم: لێدان، بەكاربێنێ، مەگەر پێشتر هەردووك شێوازی ئامۆژگاریی‌و پشتتێكردنی لەگەڵ بەكار هێنابن‌و سوودیان نەبووبێ.

(القرطبـي) لەوبارەوە گوتوویەتی:

(( أمَرَ الله أن يُبْدأ النساء بالموعظة أولاً ثم بالهجر، فأن لم يَنْجحا فالـضَّرْبُ، فأنه هو الذي يُصْلِحُها ويَحْمِلُها على توفية حقه...))[1]، واتە: خوا فەرمانی كردوە، كە بۆ ئەدەب دادانی ژنان — ژنان-ی یاخیی- سەرەتا بەئامۆژگاریی لەگەڵیان دەست پێبكرێ، دوایی بەخۆ لێدوورگرتن، ئنجا ئەگەر ئەم دووانە سوودیان نەبوو، بەلێدان، چونكە وا دیارە كە بەوە چاك دەبێو واداری دەكات كە مافەكەی جێبەجێ بكات.

(الـرّازي)یش لەوبارەوە گوتوویەتی:

((...انه تعالى ابتدأ بـالوعظ، ثـم ترقّـى منـه الى الهجـران في المضاجع، ثـم ترقّى الى الضَرْب وذلك تنبيه يجري مَجْرى التصريح في أنه مهما تحقّـق الغـرض بالطريق الأخف وجب الأكتفاء به ولم يَجُز الأقدام على الطريق الأشق))[2]، واتە: خوای بەرز بەئامۆژگاریی دەستی پێكردوە، پاشان لەوەوە بۆ سەرجێیی نەكردن هەڵكشیوە، دوایی لەوەوە بۆ لێدان هەڵكشیوە، ئەوەش ئاگاداركردنەوەیە لەئاستی ڕاشكاویی دایە، كە هەتا مەبەست بەڕێیەكی سووكتردا بێتەدی، پێویستە ئەوە بەس بێو، پەنا نەبرێتە بەر ڕێیەكی قورس.

شایانی باسیشە، كە شەرعزانان (الفقهاء)یش هەمان ڕای توێژەرەوانی قورئانیان هەیەو جەختیان لەسەر پێویست بوونی پلەپلەییو ڕیزبەندیی لە

---

١) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن)، ج٣، ص١٤٣٣.

٢) بڕوانە: (مَفاتيح الغيب)، ج١٠، ص٩٠.

جێبەجێکردنی ئەم سێ جۆرە چارەسەرەدا کردۆتەوە[١].

دووەم: لێدانی مێرد بۆ ژن تەنیا لەکاتێکدا دروستە کە ژنەکە یاخیی‌و سەرەڕۆ بێ، چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ: {...تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ..وَاضْرِبُوهُنَّ...}، کەواتە: بەهیچ ڕەنگێك دروست نیە پیاو لەژنەکەی بدات، مادام لێی یاخیی‌و سەرپەل نەبووبێ، بگرە دروست نیە بە کەمتر لەوەش سزای بدات، کە سەرجێیی نەکردنە!

سێیەم: ئنجا بێگومان ئەولێدانەش ئەگەر مەرجەکانیشی هاتبنەدی، تەنیا شتێکی ڕەوا (مُباح)یەو نە فەرزەو نە سوننەت‌و پەسندیشە، چونکە وێڕای دەلالەتی سیاقی ئایەتەکە، کە تەنیا مۆڵەت (رخصة) هەبوون‌و ڕەوایی دەگەیەنێ، چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەریش ﷺ هەن لەوبارەوە، بۆ نموونە:

- (( **لايَجْلِدْ أحدكم امرأَتَهُ جَلْدَ العَبْدِ ثم يُجامِعُها آخر اليوم** )) رواه البخاري، واتە: با یەکێکتان وەك کۆیلە بەقامچی لەژنەکەی نەدات‌و، پاشان ئێوارەش لەگەڵی جووت بێ!
- (( **لاتَضْربوا إِماء الله** )) رواه أبو داود، واتە: لە بەندە مێینەکانی خوا مەدەن!
- شایانی باسیشە پاش ئەم قەدەغەکردنەی پێغەمبەر ﷺ وادیارە ژنان لە مێردەکانیان یاخیی‌و بێ منەت بوونە، بۆیە پێغەمبەر مۆڵەتی‌دا، کە لەکاتی ناچارییدا بەلێدان سزا بدرێن، بەڵام پاش سکاڵای کۆمەڵێك لە ژنان فەرموویەتی: (( **لَيْسَ أولئك بخياركم** )) رواه أبو داود، واتە: ئەو جۆرە کەسانەتان باش نین (واتە: ئەوانەی لە ژنەکانیان دەدەن).

---

١) بڕوانە: (المغني) لابن قدامة، ج ص٤٦، وە (بدائع الصّنائع) للكاساني، ج٢، ص٣٣٤، وە (الفقه الإسلامي وأدلّة)، د. وهبة الزحيلي، ج٩، ص٦٨٥٤، وە (المفصّل في أحكام المرأة والبيت المسلم) د. عبدالكريم زيدان، ج٧، ص(٣١٠-٣١٩).

چوارەم: پاشان لێدانەكەش نابێ توند بێ، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( **لا تهجروا النساءَ الاّ في المضاجع، واضربوهنَّ ضَرْباً غير مُبَرّحٍ** )) رواه مسلم عن جابر، واتە: لەسەر جێگا نەبێ پشت لە ژنان مەكەن، وە بە لێدانێك لێیان بدەن توند نەبێ.

مەبەست لە توند (شديد) نەبوونی ئەو لێدانەش، ئەوەیە كە نەك هەر ئێسكی نەشكێنێ، بگرە گۆشتیشی بریندار نەكاتو زۆریش ئازاری پێنەگات[1].

پێنجەم: حیكمەتی مۆڵەت پێدرانی ئەو پیاوانەش كە ژنەكانیشیان لێیان یاخییو سەركەش دەبن، بەلێدانیان، پاش ئەوەی شێوازی ئامۆژگارییو پشت تێكردن سوودی نەبوو، ئەوەیە كە:

دوای ئەوەی مێرد بەقسەی خۆشو ئامۆژگاریی باش ژنەكەی دەدوێنێو دەیەوێ عەقڵو هۆشی وەخەبەر بێنێ كە واز لەیاخیبوونو سەركێشی بێنێ، بەڵام ژنەكەی گوێ بۆ حوكمی مەنتیقو عەقڵ ڕاناگرێ، ئەو جارە پیاوەكە شێوازێكی دیكەی لەگەڵ بەكاردێنێ، كە بریتیە لە پشتتێكردنو واز هێنان لەسەر جێیی، تاكو ژنەكەی حاڵی بكات كە ئەگەر ئەو گوێ بەپیاوەتی (رجولة) مێردەكەی نەدات، ئەویش دەتوانێ مێینەیی (أُنوثة) ئەو پشتگوێ بخات! ئنجا ئەگەر ئەم شێوازەش كاریگەر نەبوو لە گێڕانەوەی ژنەكەی بۆ هەقو دادگەریی، واتە: نەبە مەنتیقی عەقڵو هۆش تێگەیشتو، نە بە مەنتیقی جینسیش، وە هەر لەسەر لاملییو سەرپێچی خۆی مكووڕ بوو، ئەو جارە بەناچاری شێوازی سێیەم خۆی فەرز دەكات، كە بریتیە لە (لێدان)، بەڵام لێدانێك كە نەئێسك بشكێنێو نە پێستیش بڕووشێنێ، واتە: زیاتر ئازاردانێكی دەروونییە لەڕێی جەستەوە، نەك ئازاردانی خودی جەستەكە!

---

١) بڕوانە: (جامع البيان) للطبري، ج٤، ص(٩٦،٩٧)، وە (الجامع الأحكام القرآن) للقرطبي، ج٣، ص ١٤٣٣.

شەشەم: بێگومان نەهەموو ژنێك شایستەی لێدرانەو، نە هەموو پیاوێكیش لێدانی ژنەكەی لەخۆی دەوەشێنێتەوە، وەك فەرمایشتەكانیش ئاماژەی پێدەكەنو پێغەمبەریش ﷺ هەرگیز لە هاوسەرانی خۆی نەداوە، وەك (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: (( **ما ضرب رسول الله ﷺ خادماً له ولا امرأةً ولا شيئاً بيده**)) رواه ابن ماجه، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ كات بەدەستی خۆی لە خزمەتكارێكی یان ژنێكی یان شتێكی نەداوە.

كەواتە:

لێدانی مێرد بۆ ژنەكەی وەك دوا چارەسەری ناچاریی نەخۆشیی یاخیبوونو سەرەڕۆییەتیو، دەرمانێكی تایبەتو ناچارییە، بۆ هەندێك كەسو هەندێك حاڵەت، نەك یاسایەكی گشتی مامەڵە كردنی پیاوان بێ لەگەڵ ژنەكانیاندا، بەڵكو یاساو شێوازی گشتی مامەڵەو هەڵسوكەوتی ڕاستو دروستی پیاوان لەگەڵ ژنەكانیاندا، وەك پێشتریش باسمان كرد، ئەوەیە كە بەشێوەیەكی پەسندو جوان هەڵسوكەوتیان لەگەڵ بكەنو، ئەگەر ڕقیشیان لە هەندێك هەڵسوكەوتو خەسڵەتیان بوو، چاو پۆشییان لێبكەنو دان بەخۆیاندا بگرنو، خەسڵەتو ڕەفتارە چاكەكانیان بهێننە بەرچاوی خۆیان، وەك خوای بەبەزەیی فەرموویەتی: ﴿...وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ﴿١٩﴾ النساء﴾، كە پێشتر مانامان كردوە.

حەوتەم: پاشان دەپرسین:

ئایا ئەوانەی ڕەخنەو گلەییان لەم یاساو بڕیاری شەریعەت هەیە – كە بێگومان ڕەخنەگر لە ئایینو شەریعەتی خوا هەرچییەك بێ مسوڵمان نیە-، بەدیلیان چییە بۆ ئەوەی ئیسلام گوتوویەتی؟!

بێگومان لە حاڵەتی یاخیی بوونی ژندا، تەنیا سێ ئەگەرمان لەپێشنو،

ناچارین یەكیان هەڵبژێرین:

یەك: كە بە پیاوەكە بڵێین: بۆت نیە هیچ جۆرە لێپرسینەوەیەك لەگەڵ ژنەكەت دا بكەی، جا دیارە ڕۆژئاوا بەشێوەیەكی تیۆریی و ڕەسمیی ئەم ڕێیەی هەڵبژاردوە، بەڵام واقیع شتێكی دیكەیەو ئەو هەموو ژنە سەرو گوێلاك شكێنراوو كوتەككاریی كراوانەش، كە لەلایەن مێرد یان دۆستەكانیەوە لێیان دەدرێ و پێیاندا دەدرێ، وەك لە هۆیەكانی ڕاگەیاندندا باس دەكرێ، بەڵگەیەكی زەقە[1]!

دوو: كە بە پیاوەكە بڵێین: كەیفی خۆتەو چۆن عەقڵت دەیبڕێ ئاوا كێشەو گرفتەكەت چارەسەر بكەو، هیچ پێوەرو سنوورێكی بۆ دانەنێین!

سێ: كە بە پیاوەكە بڵێین: هەركات ژنەكەت بەپێی تەرازووی شەریعەت لایدا، بەو سێ شێوازو میكانیزمە ڕیزكراوەی كە دیاریكراون، پلەپلە لێپرسینەوەی لەگەڵ بكەی! دیارە هەموو خاوەن عەقڵ و ویژدانێكیش دەزانێ كام لەم سێ ئەگەرە ڕاست و بەجێن و، وێڕای گونجاویی لەگەڵ فیطرەتی ژن و پیاویشدا، بەرژەوەندیی پیاو و ژن و خێزانیش دابین دەكات.

بۆیە دەتوانین بەڕوونیی و ڕاشكاویی بڵێین:

بۆ چارەسەری كێشەو گرفتی یاخیبوونی ژن لە مێردەكەی —مادام بویستڕێ لە جوغزی خێزاندا چارەسەربكرێ— لەوەی شەریعەت دیاریكردوە ڕاستترو بەجێتر نیەو بەدیلی ئەوە بریتیە لە تێكبەردانی ژن و مێردو، ئاشكراشە كە هەمیشە ئاكامی دەست لەیەخەی یەكدی نانی ژن و مێرد بەقازانجی پیاو تەواو دەبێ مەگەر بەدەگمەن!

---

١) بڕوانە: (ئافرەت و خێزان لەسایەی شەریعەت دا) لاپەڕە: ٢١٥، چاپی دووەم.

## جـۆری دووەم: شـێوازی: ٤: پێکهـاتن (صـــلح)و ئاشـتەوایی:

چوارەمین شێواز کە شەریعەت ڕەچاوی کردوە، بۆ چارەسـەری گیـروگرفتەکانی نێوان ژنو مێرد، کە بەهۆی یاخیبوونو سەرەڕۆیی پیاوەوە سـەرهەڵدەدەن، بریتیـە لە پەنابردنەبەر پێکهاتن (صلح)و ڕێککەوتنو ئاشـتەوایی، وەك خـوای کاربـەجێ فەرموویـــــــەتی: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحًاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞۗ وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ١٢٨﴾ النسـاء، واتـە: وە هەرکات ژنێك مەترسی یاخیبوون یان پشتگوێ خـستنی لـە مێردەکـەی هـەبوو، ئەگەر لەنێو خۆیاندا پێکبێن گوناهیـان ناگـات، وە پێکهـاتن چـاکترە (لـە یـەك جیابوونەوە) وە ڕژدیی لەنێو دەروونەکاندا دانراوە، وە ئەگەر چاکە بکـەنو پـارێز بکەن ئەوە بێگومان خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە.

بۆ ئەوەی چەمكو واتای ئەم ئایەتەمان بۆ ڕوونتـر بێتەوە، واباشە سەرنجی هۆی هاتنە خواری بدەین[1]:

أ- (( عن ابن عباس قال: خَشِيَتْ سَوْدَةُ أن يُطلِّقها رسول الله ﷺ فقالت: يارسـول الله لاتُطَلِّقْني واجعـل يـومي لعائـشـة ففَعـل، ونزلـت هـذه الآيـة: ﴿... وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ ...﴾ الآيـة، قـال ابن عباس: فما اصطلحا عليه من شيءٍ فهـو جـائز)) رواه أبـو داود الطيالـسي ورواه الترمذي وقال: حسن غريب، واتـە: سـەودە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) - کـە هاوسەری پێغەمبەر بووە ﷺ - ترسا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەڵاقی بـدات (لەبەر پیریی) گوتی: ئەی پێغەمبەری خـوا تـەڵاقم مـەدەو ڕۆژەکـەی مـن بـۆ

---

١) بڕوانە: (المصباح المنيـر في تذهيب تفسير ابن كثيـر)، ص ٣٢٨.

عائشە دابنێ، ئەویش وایكردو، ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارێ: ﴿... وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا ...﴾ عەبـدوڵڵای كـوڕی عـەبباس خـوا لێیـان ڕازی بـێ گوتوویەتی: لەسەر هەرشتێك ڕێك بكەون (واتە: ژنو مێرد) دروستە.

تێبینی:

هەڵبەتە ناگونجێ ئەم دەقە بكرێتە بەڵگەی ئەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ بەتـەما بووە لەبەر تەمەنو پیریی (سەودە)ی هاوسەری تەڵاق بدات، چونكە مـەرج نیـە ئەوەی (سەودە) خوا لێی ڕازی بێ مەترسیی لێی بـووە، پێغەمبـەر ﷺ بـیری لێكردبێتەوەو پێویستە بشزانرێ كە ئـەو كاتـە تەمـەنی (سـەودە) لـە هەشـتا تێپەڕیوە وەك لە كتێبەكانی سـیـرەدا هاتوە.

ب- (( عن عائشة (وإنْ امرأة خافت من بعلها نـشوزاً أو إعراضـاً) قالـت: الرجـل تكون عنده المرأة المُسِنَّة لَيْس بِمُسْتَكْثِرٍ منها، يُريدُ أن يُفارِقها فتقـول: أجعلـك من شأني في حِلٍّ، فنزلت هذه الآية)) رواه البخاري، واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بـێ لـەبارەی ئایـەتی: ﴿... وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ ...﴾ەوە گوتوویـەتی: وا دەبـێ پیاوێك ژنێكـی بەتەمـەنی دەبـێ، كـە زۆر ئـارەزووی ناكـات، دەیـەوێ لێـی جیابێتەوە، ئەویش دەڵێ: لەبارەی خۆمەوە ئازادت دەكـەم، ئیـدی ئـەم ئایەتـە لەوبارەوە هاتەخوار.

(ابن كثیـر)یش دوای ئەوەی، كە چەند شتێك لـەبارەی ئـەم ئایەتـەوە دێنـێ، دەڵێ: (والظاهر من الآية أن صُلْحَهما على تـرك بعـض حقّهـا للـزوج وقبـول الـزوج ذلك خيـر من المفارقة بالكلِّية، كما أمسك النبـي ﷺ سودة بنـت زمعـة علـى أن تركَتْ يومها لعائشة رضي الله عنها، ولم يُفارقْها بَلْ تركها من جملة نـسائه، وفِعْلُـهُ ذلك لتتأسَّى به أمتهُ في مشروعية ذلك وجـوازه...)[1]، واتە: وەئـەوەی لەڕواڵـەتی

١) سەرچاوەی پێشوو، ص ٣٢٩.

ئایەتەکە دەفامرێتەوە ئەوەیە، کە مەبەست لەپێکهاتنەکەیان دەستبەرداربوونی ژنە لە هەندێك لە مافەکانی بۆ مێرد وە قبوولکردنیەتی لەلایەن مێردەوە، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ سەودەی کچی زەمعەی هێشتەوە، لە بەرانبەر ئەوەدا، کە ڕۆژەکەی خۆی دایە عائیشە خوا لێیان ڕازی بێ، وەدەستی لێهەڵنەگرت، بەڵکو لەڕیزی هاوسەرەکانیدا هێشتیەوە، دیارە ئەمەشی بۆیە کرد تاکو بۆ ئوممەتەکەی ڕەوابێو لەوەدا شوێنی بکەون.

پوختەی مەبەست:

ئەم شێوازی چوارەمە، کە شەریعەت دایناوە بۆ چارەسەری گیروگرفتەکانی نێوان ژنو مێرد، بریتیە لەوە کە هەرکاتێك ژن بەهەر هۆیەکەوەبێ، هەستی کرد کە لەگەڵی ساردە، یان دەیەوێ دەستی لێبەربدات، ئەویش (واتە ژنەکە) حەزی نەدەکرد لێی جیابێتەوە، بۆی هەیە بە لەیەك تێگەیشتن (تفاهم) پێکەوە صولحو ئاشتەوایی بکەنو ڕێك بکەون، جا چ بەوەبێ کە ژنەکە دەستبەرداری بەشێك لەمافەکانی بێو باری شانی مێردەکەی سووك بکات، وە چ بەهەرشێوەیەکی دیکەی شەرعییو ڕەوابێ، گرنگ ئەوەیە بەڕەزامەندیی هەردووك لابێت.

## جۆری سێیەم: شێوازی: ٥: دادوەرێتی نوێنەرێکی کەسوکاری پیاوو نوێنەرێکی کەسوکاری ژن:

ئەم جۆرەشیان کە شێوازی پێنجەم دەگرێتە خۆی، بۆ چارەسەری ئەو ناکۆکیەیە کە لەنێوان ژنو مێرددا سەر هەڵدەدا، جا هۆیەکەی هەرچیەك بێتو خەتابار هەرکەسێك بێ، ئەویش ئەوەیە کە خێزانو کەسوکاری هەرکام لەژنو مێرد یەکی نوێنەرێك تەرخان دەکەن، کە وەك حەکەم دڵسۆزانەو خێرخوازانە قسە لەگەڵ ئەو ژنو مێردەدا بکەنو، هەوڵی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکەیانو پێکهێنانەوەیان بدەنو، سەرەنجام چییان بۆ هەردووك لایان بەباش زانی، بۆیان بڕیار بدەن، وەك

خوای زاناو توانا فەرموویەتی: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴿٣٥﴾ النساء﴾، واتە: وە ئەگەر لە ناکۆکیی نێوانیان ترسان، ئەوە حەکەمێك لە کەس‌وکاری پیاوەکەو، حەکەمێك لەکەس‌و کاری ژنەکە بنێرن، جا ئەگەر ڕێککەوتنیان مەبەست بێ خوا پێکیان دێنێ، وەخوا زانای شارەزایە.

(ابن كثير) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا گوتوویەتی: ((وقال الفقهاء: اذا وقع الشِّقاق بين الزوجين أَسكنهما الحاكم الى جَنْبِ ثقةٍ ينظر في أمرهما ويمنع الظالم منهما من الظلم، فأن تفاقم أمرهما وطالتْ خُصومتهما، بعث الحاكم ثقةً من أهل المرأة وثقةً من قوم الرجل لِيَجْتَمِعا فينظرا في أمرهما ويفعلا ما فيه المصلحة، مما يَرَيانِهِ من التفريق أو التوفيق...))[1]، واتە: وە شەرعزانان گوتوویانە: هەرکات ناکۆکیی کەوتە نێوان ژن‌و مێردەوە، حوکمڕان لە نیزیك بابایەکی متمانە پێکراو نیشتەجێیان دەکات، تاکو لە حاڵیانەوە ڕامێنێ، وە دەستی ئەوەیان دەگرێ کە ستەم لەوی دیکەیان دەکات، بەڵام ئەگەر حاڵیان بەرەو خراپیی چوو، وە ناکۆکییەکەیان درێژەی کێشا، ئەوجار حوکمڕان باوەڕ پێکراوێك لە کەس‌وکاری ژنەکەو باوەڕ پێکراوێك لە کەس‌وکاری پیاوەکە دەنێرێ، تاکو کۆبنەوەو لەحاڵ‌و باڵیان بکۆڵنەوە، وە ئەوە بکەن کە بەرژەوەندیی تێدایەو بە باشی دەزانن، لەیەك جیاکردنەوە، یان پێکهێنانەوە.

شایانی باسیشە کە (أبو عمر ابن عبد البَرّ) یەکدەنگیی زانایانی لەسەر ئەوە هێناوە کە دوو حەکەمەکە ئەگەر ڕایان جیاواز بوو ئیعتیباری پێناکرێ، بەڵام ئەگەر ڕایان یەك بوو، ئەوە بۆ پێکهێنانەوە هەرچەندە ژن‌و مێردەکە نەشیان کردبنە وەکیل، بەڵام قسەکەیان دەبێتە بڕیارێکی پابەندکەر، بەڵام بۆ لەیەك

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ص ٢٩١.

جیاكردنەوەیان ڕاجیایی هەیەو زۆربەی زانایان دەڵێن: بۆ لەیەك جیاكردنەوەشیان ڕایەكەیان هەردەبێتە بڕیارێكی یەكلایی كەرەوە[1].

كەواتە:

شەریعەت بۆ چارەسەری گێروگرفتەكانی نێوان ژنو مێرد، پێنج ڕێبازو شێوازی دەستنیشان كردوون، كە سێیان پیاو بەكاریان دێنێ، لەحاڵێكدا كە ژن دەست دەداتە یاخیبوونو سەركەشییو، یەكیشیان ژن بەكاری دێنێ لەكاتی یاخیبوونی پیاوداو، یەكیشیان ئەركی كۆمەڵگاو دەستەڵاتە، كە دوای ئەوەی ژنو مێرد ناتوانن لە چوارچێوەی خێزاندا گێروگرفتەكانیان چارەسەر بكەن، كۆمەڵگاو دەستەڵات بەدەم كێشەكەیانەوە دەچێو، هەوڵی چارەسەركردنی دەدات، ئەویش لەڕێی نوێنەری هەردووك لایانەوە، كە وەك دوو حەكەمی دڵسۆز بڕیاری پێویستیان بۆ دەدەن.

## لە كاتی گەیشتنە بنبەست دا چارە چیە؟!

ئنجا لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات:

ئەدی ئەگەر گێروگرفتو كێشەی نێوان ژنو مێرد بەهیچ كام لەو پێنج شێوازە نەگونجا چارەسەربكرێو، پەیوەندییەكانیان بەتەواوی تێكچوونو گەیشتنە بنبەست؟!

وەڵام ئەوەیە كە لەو حاڵەتەدا ئیسلام بۆ هەركام لە ژنو مێرد دەروازەی دەربازبوونی لەو ژیانە دژوارە داناوەو، پیاو لە ڕێی تەڵاقدانەوەو ژنیش لە ڕێی دارنیـن (خُلعْ)ەوە، دەتوانن كۆتایی بەحاڵەتی ژنو مێردایەتییان بێنن.

جا دیارە توێژینەوەی مەسەلەی تەڵاق (طلاق)و (خُلعْ) لە حەوسەلەی ئەم لێكۆڵینەوەیەدا نیەو، شوێنێكی تەرخانكراوی پێویستە، بەڵام بەپێویستی دەزانم

١) هەمان سەرچاوە، ص (٣٩١،٣٩٢).

لەبارەی هەركام لە تەڵاقو داڕنینەوە، كە یەكەمیان مافی پیاو و دووەمیان مافی ژنە، سەرو دوو تێبینی بخەینە ڕوو:

یەكەم: تەڵاقدانی پیاو بۆ ژنەكەی پاش گەیشتنە بنبەستیان، بەسێ قۆناغ تەواو دەبێ‌و هەرجارەی تەڵاقێك دەخرێ، خوای كاربەجێ تبارك وتعالی لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ ... ﴿٢٢٩﴾ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ ...﴿٢٣٠﴾ البقرة﴾، واتە: تەڵاقدان دووجارە (واتە ئەو تەڵاقدانەی كە بگونجێ مێرد ژنەكەی بگێڕێتەوە لای خۆی) جا دوایی یان دەستپێوەگرتنێكی پەسند، یان بەرهەڵدانێكی باش... ئنجا ئەگەر (بۆ جاری سێیەم) تەڵاقی دا، ئەوە هەتا مێردێكی دیكە نەكات (وە لەگەڵی جووت نەبێ) بۆی حەڵاڵ نابێتەوە.

دووەم: پاش تەڵاقدانی یەكەم‌و دووەم مادام ژن هەر لە عیددەدا بێ، مێرد بۆی هەیە یەكسەر بیهێنێتەوە ژێر نیكاحی خۆی، هەربۆیەش بەتەڵاقی یەكەم‌و دووەم دەگوترێ، تەڵاقی گێڕانەوە (الطلاق الرَّجعي)، هەروەها پاش بەسەرچوونی عیددەش مێرد بەمەرجێك ژنەكەی ڕازی بێ، دەتوانێ بە گرێبەستێكی تازەو مارەییەكی تازە (عقدٍ جديد ومهر جديد) پرۆسەی هاوسەرگیریی لەگەڵ ژنەكەی دەست پێبكاتەوە، هەربۆیەش بەلەیەكترازانی ژن‌و مێرد پاش بەسەرچوونی عیددە، دوای تەڵاقی یەكەم‌و دووەم دەگوترێ: لێك ترازانی گچكە (البنيونة الصّغری).

كەواتە:

لە قۆناغی یەكەم‌و دووەمی تەڵاقداندا چ لەنێو عیددەداو چ پاش عیددە، ژن‌و مێرد دەرفەتی گەڕانەوە نێو ژیانی هاوسەرێتی‌یان لەبەردەستدا دەمێنێ.

بەڵام پاش تەڵاقدانی سێیەم كە لە قۆناغ‌و جاری سێیەمدا دەبێ، تازە ئەو دەرفەتە نامێنێ، هەربۆیەش بە لەیەكترازانی ژن‌و مێرد پاش تەڵاقدانی سێیەم

گوتراوە: لە یەکتـرازانی گەورە (البنيونة الكبـرى).

سـێیەم: لەخۆدارنینی ژن بۆ مێردەکەی بە هەر هۆیەکەوە بێ مادام ژنەکە سووربێ لەسەر جیابوونەوەی، شتێکی ڕێپێدراوە، بەوجۆرە کـە ژنو مێردەکـە لەسـەری پێك دێن، وەك گێڕانەوەی مارەیی‌یەکـەی بـۆ مێردەکـەی، وەك خـوا عزّوجـلّ فەرموویەتی: ﴿... فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ... ﴿٢٢٩﴾ البقـرة﴾، واتە: بەڵام ئەگەر ترسان کە (ژنو مێردەکـە) یاسـاکانی خوا بەرپا نەکەن، ئەوە گوناهیان ناگات لەوەدا، کە ژنەکـە خـۆی پـێ دەربـاز دەکات...

چـوارەم: هەرکاتێك مێرد ئامادەنەبوو دەستبەرداری ژنەکەی بێو ئەویش سوور بوو لەسەر داوایەکـەی، ئـەوە دادوەر (قاضـي) بـە قـازانجی ژنەکـە بڕیـار بەسـەر پیاوەکـەدا دەدا، وەئـەم ڕایـە لـەڕووی بەڵگـەوە زۆر بـەهێزترە لـە ڕایەکـەی بەرانبەری، کە دەڵێ: قازی ئەو مافەی نیە، بەسـەرهاتی (ثابـت بـن قـيس بـن شماس)و ژنەکەیشی (حبيبة بنت سهل) لەوبارەوە باشترین بەڵگەیە:

((عـن ابن عـباس أن امرأة ثابت بن قيس بـن شمـاس أتـتْ النبـي ﷺ فقالـت: يارسول الله ما أعتب عليه في خلق ولادين، ولكـني أكـره الكفـر في الإسـلام! فقـال رسـول الله ﷺ: أَتَـرُدِّين عليـه حديقتـه؟ قالـت: نعـم، قـال رسـول الله ﷺ: إقبَـلِ الحديقة وطَلِّقْها تطليقة)) رواه البخاري والنسائي، واتە: ژنی سابیتی کوڕی قەیـسی کوڕی شەمماس هاتە لای پێغەمبـەر ﷺ گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا لـەڕووی ڕەوشتو دینداریی‌یەوە هیچ گلەییم لێی نیە، بـەڵام حەزناکـەم بـە مـسوڵمانەتیی تووشی گوناه ببم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا باغە خورمایەکـەی (کـە مارەیی بووە) دەدەیەوە؟ گوتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: باغەکـەی لـێ وەربگرەوەو یەك تەڵاقی بدە.

لە کۆتایی ئەم بەشی یەکەمەشدا کە تەرخانمان کردبوو بۆ توێژینەوە لەبارەی بناغەی عەقیدەیی‌و فیکریی خێزان‌و سروشت‌و پایەکانی لە ئیسلام دا، دەڵێین:

هەرکەسێك سەرنجی یاساکانی شەریعەت بدات لەبواری خێزان‌و پەیوەندیی نێوان ژن‌و مێرددا، وە بەراوردیان بکات لەگەڵ یاساو بڕیارەکانی هەر بەرنامەو سیستەمێکی دیکەدا، بێ سێ‌و دووکردن‌و دوو دڵیی، دانی پێدادێنێ کە ڕاستترو چاکترو واقیع بینانەتر لەوەی، کە ئیسلام گوتوویەتی لە هیچ بەرنامەو سیستەمێکدا بوونی نیەو، هەر کۆمەڵگایەك بیەوێ خێزانەکانی تۆکمەو تونددو تۆڵ‌و بەختەوەرو ساغ‌و سەلامەت بن‌و، کەمترین گرفت‌و کەموکوڕییان هەبێ‌و، لەکاتی هەبوونی گرفت‌و کێشەشدا بەسێناترین شێوازو کەم زیانترین ڕێباز، چارەسەر بکرێ، دەبێ پەنا بەرێتە بەر شەریعەتی خوای کاربەجێ‌و یاساو بڕیارە سەرڕاست‌و پڕ پێستەکانی.

# بەشــی دووەم

# چـەندژنیـی و هەڵســەنگاندێکی شــەرعییـانەو ژیرانــــە



خوێنەری بەڕێــــز !

خوا یاربێ لەم بەشی دووەمەی لێکۆڵینەوەکەماندا لەبارەی خێزانەوە، دەچینە سەروکاری مەسەلەیەکی گەرمو زۆر وروژێنراوی ئەم ڕۆژانە، کە مەسەلەی چەندژنیی (تعدُّد الزوجات)یەو، هەوڵ دەدەین هێمنانە بیخەینە بەر ڕۆشنایی شەرعو عەقڵو، دادگەرانە هەڵی بسەنگێنینو سەرەنجام بیسەلمێنین کە ئەو یاساو بڕیارەی شەریعەتیش وەك سەرجەم بڕیارو یاساکانی، ئەگەر وەك خۆی فام بکرێو بەهۆی نەشارەزاییو بێئاگاییەوە، یان بەهۆی بوغزو کینە بەرانبەر بەئیسلامو مسوڵمانانو بێدینیو دوور لە خواییەوە، ستەمی لێنەکرێ، دانی پێدا دەهێنرێ کە یاساو بڕیارێکی ڕاستو دروستو پەسندو پێویستو پڕ بەپێستەو، لەبواری خۆیدا هیچ بەدیلێکی نیە کە شایستەی مرۆڤ بێو ڕووی بەرو مەجلیسی هەبێ!

شایانی باسە من بۆیە وشەی (چەندژنیی)م بۆ تەرجەمەی (تعدُّد الزوجات) بەکارهێنا، وەك کاتی خۆی لەکتێبی (ئافرەتو خێزان لەسایەی شەریعەتدا)شدا بەکارم هێناوە، چونکە وشەی (فرەژنیی)، کە ئێستا باوەو بەکاردێ، بەهەڵە دەزانم، چونکە:

(فرە) واتە: (زۆر) ئنجا بێگومان شەریعەت ڕێی هێنانی زۆر ژنانی بەپیاو نەداوە، بەڵکو ئەو پەڕی ڕێی هێنانی چواری پێداوە، دیارە لە زمانی کوردیشدا وشەی (فرە - زۆر) بۆ شتێك بەکاردێ کە لەبەر زۆریی نەژمێررێ، یان بەزەحمەت بژمێررێ، بەڵام وشەی (چەند) بۆ شتی سنووردارو ژمێرراوە.

وەئێمە -وەك عادەتی خۆمان- بۆ وەسێنا خستنی لێتێگەیشتنی ئەم بابەتە، دابەشمان کردوە بۆ دە (١٠) خاڵی سەرەکی، کە ئەمە ناوونیشانەکانیانە:

١- چەندژنیی یاسایەکی شەرعیی ڕوونو بێ چەندو چوونە.

٢- بێجگە لەدادگەریی، بەمەرجگرتنی هەر شتێکی دیکە بۆ ڕێپێدانی

چەندژنیی، قسەیەکی بێ بەڵگەو پووچە.

٣- ئەسڵ لە بنیاتنانی خێزاندا یەك ژنیی بێ، یان چەندژنیی، هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ.

٤- پاساوو حیکمەتەکانی چەندژنیی.

٥- هەوێداریی گرفتی هەن، بەڵام بەدیلەکانی کارەساتیان هەن.

٦- بەهەڵە بەکارهێنانی هەق نابێ هەقمان لەبەرچاو بخات.

٧- ئایا ڕەخنەگران لە چەندژنیی بەدیلیان چییە؟

٨- نەپیاو سالاریی‌و نە ژنسالاریی، بەڵکو شەرعسالاریی.

٩- چەند قسەو بۆچوونێکی کرچ‌و کاڵ‌و هەڵەی ڕەخنە لێگرانی چەند ژنیی.

١٠- چەند قسەیەکی دڵسۆزانە لەگەڵ داکۆکیکەراندا لەمافی ئافرەت.

ئێستاش ڕاستەوخۆ دەچینە سەرخاڵی یەکەمی ئەم بابەتە:

## ١- چەنـدژنیـی یاسـایەكی شـەرعیی ڕوون و بێ چـەندو چـوونە :

بۆیە ئەم خاڵەم كردە سەرەتاو دەستپێكی ئەم بابەتە، چونكە بەداخەوە هەنـدێك كەس لە سۆنگەی نەشارەزایی یان خۆ نەشارەزا كردنەوە، چ لە قسەو باس و مشتەو مڕەكـانی نێـو پەرلـەمانو، چ لەهۆیـەكانی ڕاگەیاندنـەوە دەیانـەوێ بەخـەڵكی مسوڵمانی بسەلمێنن، كە مەسەلەی چەندژنیی هـیچ بنەمایـەكی ڕاسـتی نیـە لـە ئیسلامداو، قورئان ئەوەی لێنافامرێتەوە كە چەندژنیی شتێكی ڕەوایە!

بەڵام بێگومان وانیەو، یاسای چەندژنیی شتێكی یەكجار ڕوونو ڕاشكاوەو، هیچ تەمو مژێكی لەسەر نیەو دەتوانین لەوبارەوە سێ جۆرە بەڵگان بێنینەوە:

**یەكـەم: چـەند ئایەتێكـی قورئـان :**

لەكتێبی خوای بێ وێنەدا چەند ئایـەتێك هـەن، كـە بـێ پـێچو پـەنا ڕەوایـی چەندژنیی (تعدُّد الزوجات) ڕادەگەیەنن، بۆ نموونە:

أ- ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴿٣﴾ النساء ﴾، واتە: وە ئەگەر ترسان كە لەگـەڵ كـچانی هـەتیودا دادگـەریی نەكەن (لەكاتێدا كە بەهاوسەریان دەگرن) ئەوە لە ئافرەتانێك كە بۆتان حـەڵاڵن مارەبكەن، دوو دوو و سێ سێو چوار چوار، بەڵام ئەگەر ترسان كە (لەگەڵیان) دادگـەریی نەكـەن، بـا هەریـەكێك بـێ، یـان ئـەو (كـەنیزەك)انـەی كـە بەدەستتانەوەن، ئەوە نیزیكترە لەوە كە لانەدەن.

وەك دەبینین خوای كاربەجێ دوای ئەوەی بەبڕواداران ڕادەگەیەنێ كـە ئەگـەر هاتو مەترسییان هەبوو لەكاتی هاوسەرگیریی لەگەڵ كچانی بێ بابدا تووشی ستەم ببنو، دادگەر نەبن، با وازیان لێبێـنن، ئاگاداریـان دەكاتـەوە كـە بۆیـان

ڕەوایە، هەركامێكیان دوو یان سێ یان چوار ژنان بێنێ، لەئافرەتانی دیكەی پێ شیاویان، ئەوەندە هەیە مەرجێك دادەنێ بۆ هەركەسێك كە بیەوێ ژنێك زیاتر بێنێ، ئەویش ئەوەیە كە دەبێ لەنێوانیاندا دادگەر بێ‌و، لەمامەڵە لەگەڵیاندا تووشی ستەم (جَوْر) نەبێ.

ب- ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلۡمُعَلَّقَةِۚ وَإِن تُصۡلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٢٩﴾ النساء﴾، واتە: وە هەرچەندە سووربن لەسەر ئەوە كە دادگەریی (تەواو) لەنێوان ژناندا بكەن بۆتان ناكرێ، بەڵام یەكجاریی لامەدەن بەجۆرێك كە ژنەكە وەك هەڵواسراو لێبكەن، وەئەگەر چاكسازیی‌و پارێزكاریی بكەن بێگومان خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

لەم ئایەتە بەپێزەشدا خوای پەنهان بین، پیاوانی بڕوادار ئاگادار دەكاتەوە كە هەرچەندە سووربن لەسەر دادگەریی كردنی تەواو لەنێوان هاوسەرەكانیاندا — واتە لەكاتێك كە یەكێكیان لەژنێك زیاتری دەبێ- هەر بۆیان ناكرێ، پاشان پێیان دەفەرموێ: كە ئەگەر دادگەریی تەواویشتان بۆ ناكرێ، لەو ئەندازە دادگەرییەدا كە گونجاوەو دەكرێ، كەمتەرخەمیی مەكەن‌و وارەفتار مەكەن كە یەكێك لە ژنەكانتان، وەك هەڵواسراو (مُعلَّقة) بێتە بەرچاو، كە نەمێردار بێ‌و نە بێ مێردیش!

شایانی باسیشە كە هەندێك كەسی سەركێڵ‌و نەشارەزا ئەم ڕستە قورئانییەیان كردۆتە بەڵگەی ڕەوانەبوونی چەندژنیی: ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ ...﴿١٢٩﴾ النساء﴾، وە گوتوویانە: لە ئایەتی ژمارە (٣)ی (النساء)دا دادگەریی بۆ ڕەوایی چەندژنیی مەرج گیراوە، وە لەئایەتی ژمارە (١٢٩)شدا ڕاگەیەنراوە كە دادگەریی لەنێوان چەند ژنێكدا ناكرێ، كەواتە: چەندژنیی دروست نیە!

بەڵام لەڕاستیدا قسەی گۆڕین دەعوایەكی پووچو بێ بنەمایە، چونكە:

١- ناگونجێ خوای كاربەجێ شتێك لەسەر مرۆڤ پێویست بكات، كە لەتوانایدا نەبێ، وەك فەرموویەتی: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ ..﴿٢٨٦﴾ البقرة﴾، واتە: خوا لەتوانا بەدەر لەهیچ كەس داوا ناكات.

كەواتە: ئەو جۆرە دادگەرییەی كە خوا سبحانە وتعالی ڕایگەیاندوە بە كەس ناكرێ ناگونجێ خوا پێویستی كردبێ!

٢- وەك ئەو جۆرە كەسانە دەڵێن، لەنێوان ئایەتی ژمارە (٣)و ئایەتی ژمارە (١٢٩)ی (النساء)دا دەبێ ناكۆكیی (إختلاف) هەبێ، بەڵام بێگومان فەرمایشتی خوا عزّوجلّ لە ناكۆكیی (إختلاف) دوورە، وەك فەرموویەتی: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ النساء﴾، واتە: ئەوە لەقورئانەوە ڕانامێنن ! ئەگەر هاتباو لەلایەن خواوە نەبووایە ناكۆكیی زۆریان تێدا دەبینی.

٣- ئنجا هەر ڕستەی دوای ڕستەی: ﴿وَلَن تَسْتَطِيعُوٓا۟ أَن تَعْدِلُوا۟...﴿١٢٩﴾ النساء﴾، كە بریتییە لە: ﴿...فَلَا تَمِيلُوا۟ كُلَّ ٱلْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ ۚ ...﴿١٢٩﴾ النساء﴾، بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە ئەو جۆرە دادگەرییەی خوا فەرموویەتی: هەرچەندە بشتانەوێ پێیان ناكرێ، جیایە لەوەی كە لەئایەتی ژمارە (٣)دا بەگونجاو (ممكن) دانراوەو بەمەرج گیراوە، چونكە ئەو ڕستەیە: ﴿... فَلَا تَمِيلُوا۟ كُلَّ ٱلْمَيْلِ ...﴾ ڕێگریی دەكات لە مەیلكردنو لادانی یەكجارەكیی، كەدیارە لادانو مەیلكردنی یەكجارەكیی مێرد بەلای یەكێك لە ژنەكانیدا لەسەر حیسابی ئەوی دیكە، لەگەڵ ئەو دادگەرییە گونجاوو بەمەرجگیراو (العدل الممكن والمشروط)ەدا تێك دەگیرێ،

نەك لەگەڵ دادگەریی تەواو (العدل التام)دا کە خوا عز وجل خۆی فەرموویەتی پێتان ناکرێ‌و بەمەرجیشی نەگرتوە.

واتە: دەگونجێ پیاو دادگەریی تەواویشی لەنێوان ژنەکانی‌دا نەبێ‌و، بەیەکجارەکییش بەلای یەکێکیاندا لاینەدابێ، بەڵام ناگونجێ دادگەریی ئاسایی نەبێ‌و، بەیەکجارەکییش بەلای یەکێك لە ژنەکانی‌دا لاینەدابێ!

٤- ئنجا تێکڕای توێژەوەرانی قورئان لەسەر ئەوە کۆك‌و یەکدەنگن، کە مەبەست لە دادگەریی (عَدْل) لە ئایەتی ژمارە (٣)ی (النساء)دا، بریتیە لە یەکسانکردنی ژنان لە: مەسرەف کێشان‌و بەرگ‌و پۆشاك‌و جێگاو شەو لەلامانەوە (النفقة والكِسْوة والسُّكْنى والَمبيت)دا، کە دیارە ئەمەش کەسێك خاوەنی ئیرادە بێ‌و، مەبەستی بێ شتێکی گونجاوەو بۆی دەکرێ‌و واقیعیش — وێڕای دەلالەتی عەقڵ- باشترین بەڵگەو شایەدە لەوبارەوە.١

هەروەها سەرجەم توێژەرەوانی قورئان لەسەر ئەوەش کۆکن، کە مەبەست لە دادگەریی (عدل) لە ئایەتی ژمارە (١٢٩)ی (النساء)دا کە خوای پەنهانبین فەرموویەتی: هەرچەندە زۆریشتان مەبەست بێ بۆتان ناکرێ: ﴿ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓاْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ ... ﴾، بەڵێ مەبەست لەو دادگەرییە نەگونجاوو بە هیچکەس نەکراوە، ئەوەنیە کە لە ئایەتی ژمارە (٣)دا بەمەرج گیراوە، بەڵکو مەبەست پێ‌ی خۆشویستن‌و سەرجێیکردن (المحبَّة والجماع)ە، وەك (الطبري) لەوبارەوە گوتوویەتی:[٢]((لن تطيقوا أيها الرجال أن تُسَوُّوا بين نسائكم وأزواجكم في حُبِّهِنَّ بقلوبكم حتى تَعدلوا بينهنَّ في ذلك)) واتە: ئەی پیاوینە ناتوانن کە لەنێوان ژنو هاوسەرەکانتاندا یەکسانی

---

١) بڕوانە: (التفسير الكبير)، ج٩، ص(١٧٦،١٧٧)، وە: (تفسير ابن كثير)، ج١، ص٤٥١، وە: (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج٣، ص١٦.

٢) بڕوانە: (جامع البيان)، ج٤، ص٤٢٢.

بكەن، لە ڕووی خۆشەویستیانەوە بە دڵەكانتان، تاكو لەوەدا دادگەرییان لە نێواندا بكەن.

هەروەها (القرطبي)یش لەوبارەوەو لە تەفسیری ڕستەی گۆڕیندا گوتوویەتی:[١] (( أخبر تعالى بنفي الأستطاعة في العدل بين النساءِ وذلك في مَيْل الطَّبْع بالمحبّة والجماع والحظّ من القلب ))، واتە: خوای بەرز هەواڵی داوە كە ناگونجێ دادگەریی لەنێوان ژناندا بكرێ، لەبواری دڵ بەلادا چوونو خۆشویستنو سەرجێیدا.

٥- بەڵگەیەكی دیكەش لەوبارەوە ئەوەیە كە دایكمان (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: (( **كان رسول الله يَقْسِمُ بين نسائه فَيَعْدلُ ثم يقول: " أللّهم هذا قَسْمي فيما أَمْلِكُ، فلا تَلُمْني فيما تَمْلِكُ ولا أَمْلِكُ " يعْني القَلْبَ** )) رواه أحمد وأهل السُّنن، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو بەدادگەریی هەموو شتێكی لەنێوان هاوسەرەكانیدا دابەش دەكرد، ئنجا دەیفەرموو: "ئەی خوایە ئەمە دابەشكردنی منە، لەوەدا كە پێم دەكرێ، دەجا لەوەدا كە تۆ پێت دەكرێو من پێم ناكرێ، لۆمەم مەكە" مەبەستی مەیلی دڵ بوو.

ج- خوای بەرزو مەزن لە ئایەتی ژمارە (٢٣)ی (النساء)دا، كە باسی ئەو ئافرەتانە دەكات، كە لەپیاو قەدەغەن هاوسەرگیرییان لەگەڵ بكات، فەرموویەتی: ﴿...وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ... ﴿٢٣﴾ النساء﴾، واتە: وە قەدەغەیە دوو خوشك پێكەوە كۆبكەنەوە، جگە لەوەی تێپەڕیوەو كاتی خۆی كراوە.

جا دیارە ئەگەر چەندژنیی قەدەغە بوایە، هیچ پێویستی نەدەكرد باسی قەدەغەیی پێكەوە كۆكردنەوەی دوو خوشك كرابایە، چونكە ئەگەر چەندژنیی قەدەغە بێ، جیاوازیی لەنێوان دوو خوشكو دوو ئافرەتی بە یەك بێگانەدا نیە!

---

١) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) ج٣، ص١٥٩١.

## دووەم: چەند فەرمایشـتێكی پێغـەمبـەر ﷺ:

فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ لەسەر ئەوە، كە (چـەندژنیی) یاسـایەكی ڕوونو ڕاشكاو و بێ گرێو گۆڵی شەریعەتە، زۆرن، بۆ نموونە:

١- ((**عن أبي هريرة قال: قال رسـول الله ﷺ: مَـنْ كانَـتْ لَـهُ امرأتـان فمـال الى إحداهما جاء يوم القيامة وأحد شِقَّيْهِ ساقِطٌ**)) رواه أبو داود الطيالسي، واتـە: هەركەسـێك دوو ژنــی هــەبنو بــەلای یــەكێكیان دا لابــدات –واتــە: ئــەو دادگەرییەی كە گونجاوە پێی هەڵنەستێ- ڕۆژی هەڵسانەوە كە دێ لایەكی لار بووەو داكەوتوە.

٢- (( **لايُجْمَعُ بين المرأة وعَمَّتِها، ولا بين المرأة وخالتها** )) متفق عليـه، واتە: نابێ ژنێكو خوشكی بابی، وەژنێكو خوشكی دایكی پێكەوە كۆبكرێنەوە.

ئنجا وەك پێشتریش لەبارەی قەدەغەبوونی پێكەوە كۆكردنـەوەی دوو خوشـكدا گوتمان، ئەگەر چەندژنیی دروسـت نەبوایـە، پێویـستی نـەدەكرد پێغەمبـەر ﷺ لێرەدا باسی ڕەوا نەبوونی پێكەوە كۆكردنەوەی ئافرەتێكو پوورێكی بكات، چونكە ئەوكاتە پێكەوە كۆكردنەوەی هەموو دوو ئافرەتێك ناڕەوا دەبوو، هەركێیەك بن!

## سـێیەم: یەكدەنگیی زانـایانو كردەوەی ئۆممەت بە پێشینو پاشینەوە:

هەرچەندە پاش دەقی قورئان یان سوننەت، بۆ ئیسپاتی یاسـایەكی شـەریعەت، پەكمان لەسەر هیچی دیكە نەكەوتوە، بەڵام بەڵگەیـەكی دیكـەش لەسـەر ڕەوایـی (چەندژنیی) ئەوەیە كە زانایانی ئیسلامو سەرجەم ئۆممەت بە پێشینو پاشـین (سَـلَف وخلـف)ەوە لەسـەر ئـەو یاسـا شـەرعییە یەكـدەنگو یـەك هەڵوێـست بوونـەو، بەكردەوەش یاسای چەندژنیی لەلایەن چوار جێنشینە سەرڕاستەكان (الخلفاء الأربعة الراشـدون) ئەبووبـەكرو عومـەرو عوسمـانو عــەلیـیەوە خـوا لێیـان ڕازی بـێو ژمارەیەكی زۆر لەزاناو پێشەوایانی دیارو بەرجەستەی ئیسلامەوە جێبەجێ كراوەو،

هەرگیزیش نەزانراوەو نەبیستراوە هیچ زاناو پێشەوایەكی ئیسلام، نكوڵیی لەڕەوایی ئەو یاسا شەرعییە كردبێ.

ئێستاش كە ڕوونییو بێ چەندوچوونی ڕەوایی یاسای چەندژنیی خرایە ڕوو دەڵێین:

ئەوكەسەی كە دەڵێ: (هیچ جیاوازییەك لەنێوان چەندژنییو زیناكردندا نیە) لە دوو حاڵان بەدەر نیە، یان خۆی بەمسوڵمان دەزانێ، یان بەئاشكرا كوفرو بێ بڕوایی خۆی ڕاگەیاندوە.

جا ئەگەر خۆی بە مسوڵمان دابنێ پێی دەگوترێ:

ئەگەر تا ئێستاش مسوڵمان بووبی، ئەم قسەیەت كوفرەو پێی لە بازنەی ئیسلام دەچیە دەرێ، چونكە:

أ- وەك یەك تەماشاكردنی حەڵاڵو حەڕامو یەكسان كردنیان، ئەنجامەكەی درۆ پاڵدانە لای خوایە سبحانە وتعالی، كە فەرموویەتی: هەرچی پاكو چاكو سوود بەخشە حەڵاڵی كردوەو، هەرچی پیسو خراپو زیانبەخشە قەدەغەی كردوە: ﴿... وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ...﴿١٥٧﴾ الأعراف﴾.

دیارە هەركەسێكیش درۆ پاڵداتە لای خوا، ئەگەر پێشتر مسوڵمانیش بووبێ، فڕی بەسەر مسوڵمانەتییەوە نامێنێ، وەك خوا عزّوجلّ فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَفۡتَرِي ٱلۡكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾ النحل﴾، واتە: بێگومان تەنیا ئەوانە درۆ بەخواوە هەڵدەبەستن، كە بڕوایان بەئایەتەكانیانی خوا نیە، وەهەر ئەوانەن درۆزنان.

ب- خوای پەروەردگار لە ئایەتی ژمارە (٢٧٥)ی (البقرة)دا مۆری كوفرو لە دۆزەخدا بەهەمیشەیی مانەوەی بەنێوچاوانی ئەوانەوە ناوە، كە بازرگانییو سوود خۆریی (البیع والربا)یان وەك یەك داناوە، وەك فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ

يَأْكُلُونَ الرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِى يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَٰنُ مِنَ الْمَسِّ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَوٰاْ وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَوٰاْ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَانتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى اللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ البقرة ﴾.

وە ئەگەر كافریش بێ پێی دەگوترێ:

جیاوازیی لەنێوان چەندژنیی حەڵاڵو زینای حەڕامدا زۆرن، بۆ نموونە:

یەك: بابای خاوەن چەند ژن، لەسەری پێویستە مەسرەفو پۆشاكو جێگاو ڕێگا بۆ ژنەكانی دابین بكات، بەڵام بابای زیناكەر پاش زینا لەگەڵ كردن، پوولێكی قەڵب بەوانەوە دەنێ، كە تەنیا كاری خۆ پێ دامركاندنەوەی پێیان بووە!

دوو: ئەو ژنانەی هاوسەرێكی حەڵاڵیان هەیە، لەنێو كۆمەڵگادا سەربەرزن، كە شتێكیان نەكردوە دژو پێچەوانەی ئاینو بەهاو ڕەوشتەكانی كۆمەڵگا بێت، بەڵام ئافرەتانی داوێن پیس، سەرشۆڕو شەرمەزارن!

سێ: ئەو ژنانەی هاوسەری حەڵاڵی پیاوێكن، منداڵەكانیان بابێكی ئاشكراو شەرعییان هەیەو لەدایكیان ناپرسن: بابمان كێیە؟! بەڵام منداڵەكانی ئافرەتانی داوێن پیس، ئەگەر هەر بەرێوەش لەبار نەچوێنرابن، كاتێك گەورە دەبن، نازانن بابیان كێیەو خەڵكیش بە زۆڵو بیژوو ناویان دەبات!

چوار: لە ئەنجامی زیناو داوێن پیسیدا، چەندان نەخۆشی كوشندەو بێڕەزای وەك: ئیدز، سەیەلان، زوهریی، هەربس، بالوكەی كۆئەندامی زاووزێ...هتد پەیدا دەبن، بەڵام هیچ كام لەو جۆرە نەخۆشیانەو هاووێنەكانیشیان بەهۆی پەیوەندی شەرعیی لەنێوان پیاوو ژنەكانیدا پەیدا نابن[١]!

---

١) بڕوانە: (الجنس والتربية الجنسية في ضوء الشريعة الأسلامية) د. محمد الهواري، المجلة العلمية للمجلس الأوربي للأفتاء والبحوث، ص (١٢٢-١٢٧).

كـــەواتـــە:

بێگومان كەسێك چەندژنیی‌و زیناكردنی پێ وەك یەك بێ، نە دەتوانێ خۆی بـە مسوڵمان دابنێ، نە بە خاوەن عـەقڵ‌و ویژدان!

ئێستاش نۆرەی خاڵی دووەمە:

## ٢- بێجگـە لە دادگەریی، بەمەرجگرتنی هەرشـتێكی دیكـە بـۆ ڕێـپێدانی چـەندژنیـی، قسـەیەكی بێ بەڵگـەو پووچـە:

بێگومان بەندو مەرج (قیدو شرط) خستنە سەر ئەو شتانەی، كە خـوا حـەڵاڵی كردون، بەجۆرێك كە ئەو بەندو مەرجانە ببنە مایەی قەدەغـەكرانی ئـەو شـتانەو پەكخستن (تعطیل)و لەنێوەڕۆك خاڵیكردنەوەی ئەو دەقـە شـەرعییانەی لـەوبارەوە دەدوێن، جۆرێكە لەگۆڕین‌و لادان (تغيرو تحريف)ی ئایینی خوای كاربەجێ، جا ئەو ڕەفتارە لەلایەن هەركەسێكەوە بێ‌و بەهەر بیانوو و پاساوێكەوە بێ.

بۆیە پێویستە هەموو ئەو كەسانەی، كە بەو جۆرەی باسمان كرد، لەگەڵ یاسـای (چەندژنیی)دا ڕەفتاریان كـردوەو دەكـەن، زۆر بـاش بـزانن كـە بـەو هەڵوێـستەو ڕەفتارەیان بیانەوێ یان نا، ئاوێ بـە ئاشـی ئەوانـەدا دەكـەن كـە دژی ئـەو یاسـا شەرعییەن، چونكە ئاكامی هەردووك لایان هەریەكە، كە بریتیـە لـە پەكخـستنی ئەو ئایەت‌و فەرموودانەی كە ئەو یاسـا شـەرعییەیان گرتۆتـە خـۆ، كـوردەواریش گوتوویانە: (چ گورگ بتخوا چ سوار بتبا!).

چـونكە خـوای بەبـەزەیی‌و دادگـەر عزّوجـلّ لـەكاتی ڕاگەیانـدنی ڕێپێـدانی چـەندژنیی‌دا، تەنیا یەك مەرجی داناوە، كـە بریتیـە لـە دادگـەریی (عـدل)، كـە ئەمیش -وەك لە خاڵی پێشوودا خـستمانەڕوو- مەبەسـت پـێی یەكـسان كردنـی مێردە بۆ ژنەكانی لە مەسرەف كێشان‌و پۆشاك‌و جێگاو ڕێگـاو شـەو لەلامانـەوە (النفقة والكِسْوة والسُّكْنى والمَبيْت)دا، كەواتە: زیاد كردنی هەر بەنـدو مـەرجێكی

دیکـــــەی وەك:

نەخۆشیی، نەزۆکیی، ڕازی بوونی ژنی یەکەم .... قـسەیەکی هەڵـەو پووچـەو یاسای (چەندژنیی)یش دەکاتە نیمـچە پـەکخراو (شـبه مُعطَّـل)، ئیـدی سـەرەنجام ئەوەی کە خوای بەرزو بێ وێنە بـەڕوونیی‌و ڕاشـکاویی حـەڵاڵی کـردوە، هەنـدێك کەس -هەر بەناوی ئاینیشەوە- بە پێچ‌و پەناو فرت‌و فێڵ، قەدەغەی دەکەن!!

جادیارە ئێمە لێرەدا ڕووی قسەو ڕەخنەو گلەییمان لە کەسانێك نیە کـە خۆیـان بەمسوڵمان نازانن، چونکە ئەو جۆرە کەسانە پـێش ئەومەسـەلەیە، گـەلێك شـتی دیکـەیان هەیـەو لێپێـچانەوەیان لەسـەر ئـەو مەسـەلەیە، ئەوپەنـدەی بەسـەردا دەچەسپێ کە دەڵێ: (گاڕانیان بە خڕی دەبـرد لـە گۆلکـە سـووری دەپێـچایەوە!)، بەڵکو ڕووی قسەو ڕەخنەو گلەیی‌مان لەو کەسانەیە، کە لە بازنـەی ئیـسلامدان‌و بەناوی شەریعەتەوە دەدوێن!

چونکە نە قورئان‌و سوننەت‌و نە بەرهەم‌و کەلەپووری زانایانیش[١]. بێجگـە لـە دادگەریی‌و توانای مەسرەفکێشان، هیچ مەرجێکی دیکەیان بۆ بابای چەند ژنهـێن (مُعَدِّدْ) دیاری نەکردوە، ئنجا لەڕاستی‌دا توانای مەسرەفکێشانیش هەر دەچـێتەوە نێو دادگەرییەوە، چونکە دادگەریی کـردن بـەبێ ئیمکانیـەت‌و هـەبوون نابـێ، وە لەڕاستی‌دا کەسێك لەڕووی هەبوونەوە دەستڕۆیشتوو نـەبێ، نـەك چـەند ژن، بگـرە یەك ژنیشی بۆ مەیسەر نابێ، وەك خـوای کاربـەجێ فەرموویـەتی: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ...﴿٣٣﴾ النـــور﴾، واتـــــە: وە ئەوانەی توانای ژنهێنانیان نیە، بـا خۆیـان پـاك داوێـن ڕابگـرن، هـەتا خـوا لـە بەخششی خۆی بێنیازیان دەکات.

---

١) بڕوانە: (المفصّل فی أحكام المرأه والبيت المسلم)، ج٦، ص(٢٩٣،٢٩٤).

## ٣- ئەسڵ لە بنیاتنانی خێزان دا یەك ژنیی بێ، یان چەندژنیی هیچ لە مەسەلەكە ناگۆڕێ:

لەوبارەوە كە ئایا ئەسڵو بناغە لە بنیاتنانی خێزاندا، یەك ژنییە، یان چەندژنیی؟ كەموزۆر لەنێو زانایاندا ڕاجیاییو مشتومڕ هەیە، ئەوانەی كە دەڵێن: چەندژنیی ئەسڵە، ئەوە بە بەڵگە دێننەوە كە خوای بێهاوتا عزّوجلّ كە باسی ژنهێنانی كردوە، لە ئایەتی ژمارە (٣)ی (النساء)دا بە دوو دوو (مَثْنى) دەستی پێكردوە: ﴿فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ...﴿٣﴾ النساء﴾.

كەواتە: ئەسڵ ئەوەیە پیاو لە ژنێكی زیاتر هەبێ!

جا دیارە ئەوانەش كە دەڵێن ئەسڵ یەك ژنیی‌یە، بۆیان هەیە بڵێن: ئەم ئایەتە باسی ڕەوایی هێنانی زیاتر لە ژنێك دەكات هەتا چوار، بۆ كەسێك لەخۆی ڕاببینێ كە دادگەر دەبێ، نەك باسی ئەوە كە خێزان چۆنو لە چەند ژن پێك دێ، بۆیە ناگونجێ ئەو ئایەتە بكرێتە بەڵگەی ئەسڵ بوونی چەندژنیی لە بنیاتنانی خێزاندا.

بەڵام بە هەرحاڵ، من ڕام وایە كە بە ئیسپات بوونی هەر كام لەو دوو ڕایە، مەسەلەی ڕەوا بوونی چەندژنیی هیچ گۆڕانی بەسەردا نایەت، وە پێشم وایە ئەو مەسەلەیە عورفو باوی كۆمەڵگاو هەلو مەرجەكانی ژیانو گوزەران، كاریگەریی زۆریان لەسەری هەیەو زیادبوونی ڕێژەی ئافرەتانیش، لە كچانی قەیرەو بەتەمەنو بێوە ژنان لە نێو كۆمەڵگاو خەڵكێكی مسوڵماندا، حوكمی ئەو مەسەلەیە زۆر دەگۆڕێ، چونكە تاكەكانی كۆمەڵگایەكی مسوڵمان بەنێرو مێیو درشتو وردەوە بەرانبەر بە یەكدی بەرپرسیارنو، هیچ ماقووڵ نیە پیاوانی مسوڵمانی خاوەن توانا، لەكاتی بەرزبوونەوەی ڕێژەی ژمارەی ئافرەتاندا، دەستەو ئەژنۆ دابنیشنو بیر لە چارەسەرێك نەكەنەوە! ئاشكراشە كە ئەوە ئەركی هەركام لە حكومەتو دامەزراوە ئەهلییو مەدەنییەكانە، كە لەو حاڵەتەدا ڕۆڵی خۆیان بگێڕن، بۆ ڕاست كردنەوەو هێنانەوە تایی تەرازووی لاری كۆمەڵگاو، دەرباز كردنی ئافرەتان لە

قەیران‌و كێشــەی بێ ماڵ‌و حاڵیی‌و ژینتــاڵیی، وەك خوای كاربەجێ فەرموویەتی: ﴿وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾ النـور﴾، واتــە: وە هاوســەرگیریی بــۆ پیــاوان‌و ئافرەتانی بێ هاوســەرتان بكــەن، هــەروەها بــۆ ئــەو كۆیلــەو كەنیزەكانــەتان كــە شایستەن، ئەگەر هەژاریش بن خوا لە بەخششی خۆی بێ نیازیان دەكــات، وەخــوا (بەخشش) فراوانی زانایە.

دیارە بە پــێی ئــەم ئایەتــە بــەپیرۆزەی كتێبــی بــەڕێزی خــوا عزّوجــلّ، ئــەركی كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییە كە هەڵسێ بەئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیریی بۆ سەرجەم ئەو پیاوو ئافرەتانەی كە لەبەر هەر هۆیەك بــێ نــەیانتوانیوە هاوســەردار بن، جا ئەو پیاوو ئافرەتانە چ هەر لە ئەسڵدا هاوسەردار نــەبووبن، چ هاوســەریان هەبووبێ‌و ئێستا سەڵت‌و تەنیابن، چونكە وشەی (أيامى)كۆی (أيِّم)ەو ئەمیش بــۆ هەر كام لە پیاو و ئــافرەتی بــێ هاوســەر بــەكاردێ، جــا چ هــەر نــەیانبووبێ، چ هەیانبووبێ‌و نەیانمابێ، وەك (الجوهري) لە شارەزایانی زمانەوە هێناویەتی[(١)].

كــــەواتە:

ئەوە ئەركی سەرشانی كۆمەڵگاو دەوڵەتە لە ئیسلامدا، كە لەكاتێكدا پیــاوان‌و ئافرەتــان دووچــاری ئــەو حاڵەتــە دەبــن، كــە بێگومــان كێــشەو قــەیرانێكی كۆمەڵایەتییەو دەرەنجامی زۆر خراپی لــێ دەكەونەوە، بە جددیی خەمیان لێ بخۆن‌و هاوكارو دەستبارگریان بن، ئاشكراشە كاتێك كە ڕێژەی ئافرەتان بــەرزتر دەبێتــەوە لەهی پیاوان، بێجگە لە (چەندژنیی) هیچ چارەسەرێكی دیكەی شەریف‌و شەرعیی نیە، بــۆ چارەســەری كێــشەی بــێ هاوســــەریی ئافرەتــان، وەك دواتــریش زیــاتر لەوبارەوە دەدوێیــن.

---

١) بڕوانە: (المصباح المنيـر في تهذيب تفسيـر ابن كثيـر)، ص٩٤٠.

ئێستاش نۆرەی خاڵی چـوارەمە.

## ٤- پاســـاوو حیکـمـەتەکـانی چـەندژنیـی:

لە ئەلفو بێو سەرەتایەکانی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامییە، کە بابای مسوڵمان لە سەداسەد قەناعەتی وابێ: کە هیچ یاسایەکی شەریعەتی خوای پەروەردگار نیە، کە حیکمەتو پاساوی مەنتیقی خۆی نەبێ، چونکە شەریعەت بە هەردووك بەشـی قورئانو سوننەتییەوە، سەرچاوەکەی سرووش (وەحی) خوای بـەرزو بـێ وێنەیـەو، دیارە خواش عزّوجلّ خاوەنی ئەوپەڕی بەزەیی‌و ئەوپەڕی زانیاریی‌و حیکمـەتی بـێ سنوورو، هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندی ڕەهایە، کەواتە:

ناگونجـێ خوای کاربەجێ (حکیم) شـتی بێحیکمـەتو نابەجـێ بفەرمـــوێو بڕیار بدات، پاکیی‌و بەرزیی بۆ خوا، کە جگە لە هەقو ڕاستیی، شـتێکی دیکـەی لێ بوەشێتەوە.

کـەواتە:

ئایا شەریعەتی خوای کاربەجێ تبارك وتعالی، چ حیکمـەتو بەرژەوەندییـەکی ڕەچاو کردوە لە دانانی یاسای (چـەندژنیی)دا ؟!

لە وەڵامدا دەڵێیـن:

شەریعەتی خوای کاربەجێ عزّوجلّ لە دانانی یاســای (چـەندژنیی)دا کۆمـەڵێك حیکمەتی ڕەچاو کردوون، بۆ نـموونە:

**یەکەم: ڕاستییەکی سەلمێنراوی واقیعیو زانستییە کە لە ڕووی جەستەییو جینسییەوە ئافرەت زووتر لە پیاو پێدەگاتو زووتریش دەوەستێو پەکی دەکەوێ:**

زووتر بالغ بوونی کچ لە کوڕو وەستانی لە گەشەی جەستەیی شتێکی ئاشکرایەو، ئافرەتیش لای زۆری هەتا تەمەنی (٤٥-٥٠) سالّی توانای منداڵبوونو وەچە خستنەوەی هەیە، بەلاّم پیاوان هەتا (٧٠) سالّییو زیاتریش ئەو توانایەیان هەر دەمێنێ.

کەواتە:

بەلای کەمەوە ماوەیەکی (٢٠) سالّیی ئافرەت لە پیاو بەجێ دەمێنێ، ئنجا بەتایبەت ئەگەر ژنو مێردەکە بەدرەنگەوە ژیانی هاوسەرییان پێکەوە نابێ، ئەوە هێنانی ژنێکی دیکە بۆ پیاوەکە پێویستتریش دەبێ.

**دووەم: هەمیشەو بەدرێژایی مێژوو لە سەرجەم کۆمەڵگایەکان دا ژمارەی ئافرەتان لە هی پیاوان زیاتر بووە، بەهۆی تێداچوونی پیاوان لە کاروکاسبیو جەنگو کوشتارو ڕووبەڕووبوونەوەکاندا:**

ئەمیش ڕاستییەکی مێژوویيو واقیعییو کۆمەلاّیەتییەو نکوولّیی لێ ناکرێو، کاتێکیش کە هاوسەنگی (توازن)ی نێوان ڕێژەی پیاوانو ئافرەتان تێکدەچێ، بێجگە لە یاسای شەرعیی چەندژنیی هیچ شتێکی دیکە نابێتە فریادڕەسی ئەو ئافرەتانەی کە مێردێکی تەنیاو سەلّتیان چنگ ناکەوێ، دیارە بەهیچ ڕەنگێکیش نە ئیسلامو نە هیچ ئافرەتێکی پاكو شەریفیش بە داوێنپیسی ڕازی نابێ، هەروەها ئیسلام لەوەش زیاترو واقیعبین ترو بەبەزەیی ترە کە بەئافرەتانی زیاد لە ژمارەی پیاوان بلّێ: پێویستە هەر خۆتان کپ بکەنو لەمالّی بابتان کەزی سپی بهۆننەوە! چونکە وەك دواتریش دەیخەینە ڕوو، لەکاتی زیاتربوونی ژمارەی ئافرەتان لە کۆمەڵگادا، هیچ بەدیلێك بۆ چەندژنیی نیە، بێجگە لە زیناو داوێن پیسی، یان

خۆ کپ کردنەوەو پرچی سپی هۆنینەوەی ئافرەتانێکی زۆر لەماڵی بابیان!

**سێیەم: ئافرەت جگە لە حاڵەتی منداڵبوون و زەیستانی، کە دەوری چل شەو یان زیاتریش دەخایەنێ، مانگانەش دەکەوێتە حەیزەوە کە لای کەمی چەند ڕۆژێك و لای زۆری هەتا پازدە ڕۆژ، ناگونجێ سەرجێیی لەگەڵ بکرێ:**

بەڵێ ئەمیش پاساوێکی دیکەی هێنانی زیاتر لەژنێکەو، لەبەر ڕوونیشی پێویستی بەڕوونکردنەوە ناکات.

**چوارەم: مەگەر چۆن دەنا هیچ کۆمەڵگایەك نیە ڕێژەیەك لەکچانی قەیرەو بەتەمەن و بێوەژنی تێدا نەبێ، ئاشکراشە کەمتر وایە کە کوڕێکی گەنج ئامادەبێ کچێکی بەتەمەن یان بێوەژنێك بهێنێ:**

بەڵێ بەڕاستی پاساوی (چەندژنیی) دەروازەیەکە بۆ لێوە دەرباز بوونی کچانێکی بەتەمەن و، ژنانێکی بێوە ژن، لەژیانی تەنیایی و بێ ماڵ و مێردیی، بۆیە ئەگەر عەقڵ و مەنتیق و بەرژەوەندی هەموولایەك ڕەچاو بکرێ، پێویستە ئافرەتان پێش پیاوان داکۆکیی بکەن لە کارپێکردن و کاراکردنی یاسای چەندژنیی، بەتایبەت کچانی قەیرەو ژنانی بێوەژن!

ئنجا ئەوانەش کە دەڵێن:

ئەو پیاوانەی کە ژنێك زیاتر دێنن، هەرگیز چاویان لە کچێکی بەتەمەن یان بێوەژنێك نیە، هەرچەندە قسەکەیان تاڕادەیەك ڕاستیی تێدایە، بەڵام زێدەڕۆیی‌شی تێدایە، چونکە زۆرێك لە پیاوان کچی بەتەمەن و بێوەژنیشیان هێناوە، پاشان هەر چۆن بێ کەمبوونەوەی ڕێژەی ئافرەتانی بێ مێرد، بەهۆی چەند ژنییەوە هەل و دەرفەتی زیاتر بۆ کچانی قەیرەو بێوەژنەکان دەڕەخسێنێ، ئەگەرنا بەهۆی ڕێگرتن لە چەندژنیی‌یەوە، بەردەوام ڕێژەی ئافرەتان زیاد دەکات و، ئەوجۆرە ئافرەتانەش دەرفەتی شوو کردنیان کەمتر دەبێتەوە!

## پێنجەم: نەزۆکیی ژن:

ئەمیش حیکمەتو پاساوێکی دیکەی یاسای چەندژنییە، چونکە پیاوێك کەژنەکەی نەزۆکەو منداڵی نابێو حەزیش دەکات وەچەی هەبێ، بێجگە لەهێنانی ژنێکی دیکە هیچ ڕێ چارەیەکی دیکەی نیە، جا ئایا واباشە بۆ ژنەکەی کە مێردەکەی ناچاربێ تەڵاقی بدات، تاکو بۆی بلوێ ژنێکی دیکە بێنێ، یان بەڕێزوحورمەتو وەفادارییەوە پێکەوە بمێننەوە؟!

دیارە لە حاڵەتی نەزۆك (عقم) بوونی پیاویشدا، ژن بۆی هەیە ئەگەر منداڵبوونی لەلا مەبەست تر بێ لە مانەوە لەلای مێردەکەی، کە داوای جیابوونەوە بکاتو مێردێکی دیکە بکات.

جاهەر چەندە شەرعزانان لە بارەی ئەم مەسەلەیەوە -کە ئایا ژن بەهۆی نەزۆکیی پیاوەوە بۆی هەیە داوای جیابوونەوە بکات؟!- ڕاجیایییان هەیە، بەڵام بەڕاستی ئەوەی گوتمان لەڕووی بەڵگەوە بەهێزترە، چونکە:

١- ڕستەی ﴿... وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ ... ﴿٢٢٨﴾ البقرة﴾، چەمکەکەی فراوانەو تێکڕای مافەکانی دەگرێتەوە، کەواتە: ئەگەر پیاو بۆی هەبێ لە بەر پەیدابوونی منداڵو مادام ژنەکەی ڕازی نەبێ ژنی بەسەربێ، دەستبەرداری ژنەکەی ببێ، دەبێ ئافرەتیش هەمان مافی هەبێ.

٢- پێشتر باسمان کرد کە ژنێك نەتوانێ لەگەڵ مێردەکەیدا بژیەتو لێی بێزاربێ، جا بەهەر هۆیەکەوە بێ، شەریعەت ڕێی دەدات کە لە ڕێی دارنین (خُلع)ەوە خۆی لێ دەرباز بکات، بە بەڵگەی ئەوە کە (بخاري) لە (ابن عبّاس)ەوە گێڕاویەتەوە کە کاتێك ژنی (ثابت بن قيس بن شمّاس) هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺو داوای کرد کە لە مێردەکەی جیابێتەوە، گوتی: (ما أَعْتَبُ عليه في خُلُقٍ ولادين) واتە: لە ڕووی ڕەوشتو دینداریییەوە هیچ گلەییم لێی نیە، کەواتە: دیارە هەر لێی بێزار بووەو پێی ناڕازیی بووە، دەجا ئەگەر بەهۆی

بێزاریی‌و نارازیبوونەوە ژن بۆی هەبێ لە مێردی جیابێتەوە، دیارە بەهۆی نەزۆكییەوە چاكتر بۆی هەیە.

٣- زانای ناوداری ئیسلام (عبدالرزاق) لە كتێبی (مُصَنَّف)دا هێناویەتی، كە (عومەری كوڕی خەتتاب) خوا لێی ڕازی بێ لە ڕۆژگاری فەرمان ڕەوایەتی خۆیدا، پیاوێك كە نەزۆك بووە لەسەر كاری كۆكردنەوەی زەكات دادەنێ، ئەویش ژنێك مارە دەكات، جا عومەر پێی دەڵێ: (أَأَعْلَمتَها ؟!) ئایا پێت ڕاگەیاندوە -كە نەزۆكیی-؟ دەڵێ: نەخێر، ئەویش دەڵێ: (فَٱنْطَلِقْ فأعْلِمْها ثم خَيِّرْها) واتە: دەجا بچۆ ئاگاداری بكەوە، پاشان سەرپشكی بكە[(١)].

## شەشەم: نەخۆشیی ژن:

نەخۆشیی ژنیش پاساوو حیكمەتێكی دیكەی دانرانی یاسای چەندژنیی‌یە، دیارە مەبەستیش لە نەخۆشیی زۆر شتە، نەك تەنیا ئەو نەخۆشیانەی كە وا لە ژن دەكەن توانای سەر جێیی نەبێ، جادیارە لەوحاڵەتەش‌دا هەم بۆ پیاو هەم بۆ ماڵ‌و منداڵەكەیشی هەبوونی هاوسەرێكی دیكە، دەبێتە شتێكی پێویست‌و ناچاریی.

شایانی باسیشە كە ژنیش لەم مەسەلەیەدا مافی ئەوەی هەیە، كە ئەگەر مێردەكەی نەخۆش بوو لێی جیابێتەوە، جا هەرچەندە شەرعزانان لەم مەسەلەیەشدا ڕاجیایی (إختلاف)ێكی زۆریان هەیە، كە لەژێر باسی لێكترازاندن بەهۆی ناتەواوییەكی سڵەمێنەرەوە (التفريق للعيب المُنَفِّر)دا باسكراوە، بەڵام واپێدەچێ ڕایەكەی (الزّهري)و (شريح القاضي)كە (ابن القيِّم)یش پەسندی كردوە، لە هەموو ڕایەكان بەهێزتر بێ، كە هەركام لە ژن‌و مێرد بۆیان هەیە، بەهۆی هەبوونی ناتەواویی سڵەمێنەرە (عيب مُنَفِّر)ەوە، چ بەردەوام بێ چ كاتیی، وەك: نەزۆكیی،

---

١- بڕوانە: (مصنَّف عبدالرزاق)، ج٦، ص١٦٢، وە بڕوانە: (التفريق القضائي من خلال قنوات مجلس القضاء في الشريعة الأسلامية) د.صهيب حسن، (المجلة العلمية للمجلس الأوربي للأفتاء والبحوث)، ص(٢٤٥-٢٦٠).

بەڵــەكیی، سەرجێیی پێنەكران،...هتد، لەیەك جیاببنەوە[1].

**حەوتەم: ئافرەت هەیە لەبەر هەر هۆیەك بێ، حەزدەكات ژنی دووەم یان سێیەم یان چوارەمی پیاوێكی هاوسەردار بێ، نەك ژنی یەكەمو تەنیای پیاوێكی دیكە:**

حیكمەتو پاساوێكی دیكەی یاسای چەندژنیی ئەوەیە كە ڕێ لەبەردەم ئافرەتێكدا ئاچووغو تەخت بێ، كە سێبەری پیاوێكی بەژنو ماڵ هەڵدەبژێرێ، بەسەر هی یەكێكی سەڵتو بێو ژنو ماڵدا ، بەڵێ چ ئیشكالێكی تێدایە ئەگەر ئافرەتێك نیوەی یان كەمتری تەمەنو ژیانی پیاوێكی بەژنو ماڵی پێ باشتربێ، لە تێكڕای تەمەنو ژیانی یەكێكی سەڵتو تەنیا ؟!

ئاشكراشە كە نەك هەموو پیاوێكیش شایستەییو تواناو بڕستی مەعنەوییو جەستەییو ماددیی، زیاتر لەژنێكی نیەو، ئافرەتانیش ئامادەیی شوو پێكردنیانیان نیە، بەڵكو پیاو هەیە ژنێكیشی لێ زیادەو شایستەی ئەوە نیە كە ژنێكیشی هەبێ! كەمیش نین ئەو ژنانەی كە گیرۆدەی داوی ئەو جۆرە پیاوانە بوونەو، دووچاری مەینەتییو ژینتاڵییەكی زۆر هاتوون.

هەروەها لە بەرانبەر ئەو جۆرە نێرینانەدا، مێینەی واش هەنو، پێشینانیش بەخۆڕایی نەیانگوتوە: (پیاو هەیە پیاویلكەش هەیە)و (ژنیش هەیەو ژانیش هەیە)!

بەڵـێ:

ئەمانە حەوت جۆرە حیكمەتو پاساو بوون، كە شەریعەتی بێ هەڵەوپەڵەی خوای بەرزو مەزن، لە دانانی یاسای (چەندژنیی)دا ڕەچاوی كردونو، لە خاڵی داهاتووشدا تیشك دەخەینە سەر گیروگرفتەكانی ژیانی هەوێداریی، كە بەهۆی

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ص٢٦٠.

چەند ژنییەوە سەر هەڵدەدەن، چونكە دەزانم كە پرسیاری: ئەدی بۆچی باسی گیروگرفتەكانی ژیانی چەندژنیی ناكەی؟! لە دەلاقەی زۆر بیرو زەنینانەوە سەرەتاتكەیەتی!

## ٥- هەوێداریی گرفتی هەن، بەڵام بەدیلەكانی كارەساتیان هەن:

ژیانی هاوسەری بەگشتی لە گیروگرفتو چەرمەسەریو خەمو خەفەت خاڵی نابێ، ئنجا بێگومان خێزانێكیش، كە لە چەند ژنێك پێكدێ، زیاتر زەمینەی گیروگرفتو ئاژاوە تێدا پەیدا بوونی تێدا ڕەخساوەو، ئەمە ڕاستییەكە نكوولیی لێناكرێ، بەڵام پێویستە لەكاتی قسەلێكردنی ئەم مەسەلەیەدا لە چەند شتێكیش بێ ئاگا نەبین:

یەك: نابێ بەهۆی هەبوونی گیروگرفت لە ژیانی چەندژنییدا، هیچكەس خەیاڵ پلاوی وابكات كە ژنو مێردی تەنیا هەموو ژیانیان خێرو خۆشییەو، هیچ گیروگرفتێكیان نیە!

بەڵكو ژیانی بەشەر بەگشتی گرفتارییو ناڕەحەتیی، هەر تێدایە تەنانەت هی مرۆڤێكی تەنیاش، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ﴿٤﴾ البلد﴾، واتە: بێگومان مرۆڤمان لە گرفتارییو ڕەنجدا دروست كردوە.

دوو: گیروگرفتەكانی خێزانی چەندژنیی زیاتر لەوەوە سەر هەڵدەدەن كە پیاو نادادگەر بێ، هەر بۆیەش خوای كاربەجێ دادگەریی (عَدْل) كردۆتە مەرجی ڕەوابوونی هێنانی زیاتر لە ژنێك: ﴿...فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً ...﴿٣﴾ النساء﴾، هەروەها هۆكارێكی دیكە سەرهەڵدانی گیروگرفتەكانی خێزانی چەندژنیی، بریتییە لە پابەندنەبوونی ژنەكان، یان یەكێكیان بە سنوورو ئەدەبەكانی شەریعەتەوە، كە دیارە ئەمەش پێویستە مێرد لەڕێی پەروەردەو ئامۆژگارییكردنەوە چارەسەری بكات.

سـێ: شـایانی باسیـشە کـە یـەکێك لـە مەرجـەکانی دادگـەری پیـاو لـەنێوان هاوسەرەکانیدا، ئەوەیە کە پێکەوە نەبن‌و ماڵ‌وحاڵ‌و نان‌و چێشتیان جیـا بـێ، کە دیارە زۆر لە شەڕە دەندووکەو تێکگیرانی ژنانی پێکەوە هەوێ، لە ئەنجامی پێکەوەبوونیاندا پەیدا دەبێ.

ئنجا دەڵێیـن:

دوای ئەوەی لە خاڵی چوارەمدا خستمانە ڕوو، کـە چـەندژنیی بـەو حیکمـەت‌و پاساوانەوە کە ڕوونمـان کردنـەوە، شـتێکی پێویـستەو چـارەمان نیـە کـە پـەنای پێبەرین، بەڵێ دوای ئەوە دەبێ بڵێین: هەرچەندە چەندژنیی کەم‌و زۆر گیـــروگرفتی هەن، بەڵام بێگومان چەندان بەرژەوەندیی‌و سوودیشی هەن، بۆیە ناچارین لەپێناوی ئەو بەرژەوەندیی‌و سوودانەدا تەحەممولی ئەو گیـروگرفتانە بکەین، چونکە سروشتی ژیانی دنیا وایە مەگەر چۆن دەنا هـیچ بەرژەوەنـدیی (مـصلحة)یـەك بـەبێ سـەر ئێـشەو گیـــروگرفت‌و ئـازار مەیـسەر نابـێ، دیـارە بەرژەوەنـدییش بریتیـە لـە وەدەستهێنانی سوودەکان‌و دوورخستنەوەی زیانەکان (جلب المنـافع ودفـع المَـضارّ)، کە دیارە وەك ڕوونیشمان کردەوە، یاسای چەندژنیی کۆمەڵێك سوودی بۆهەرکام لە پیاوو ژن‌و کۆمەڵگاش دابین دەکات‌و، کۆمەڵێك زیانیشیان لێوە دوور دەخات.

پاشـان دەڵێیـن:

بۆ ئـەوەی لـە حیـساباتماندا بەهەڵـەدا نەچـین، پێویـستە هـەرکات تەماشـای کەم‌وکووڕیی‌و گیروگرفت‌و زیانەکانی شتێکمان کرد، لە کەم‌وکووڕیی‌و گیـروگرفت‌و زیانەکانی بەدیلەکەی، یان بەدیلەکانیشی بێئاگا نەبین، چونکە ڕەنگە بەوجۆرە زۆر وەك ئەو دادوەرەمان لێبێ کە بە قازانجی بابایەك حوکم دەردەکـات، کـە چـاوێکی کوێر بووە، بەڵام هەردووك چاوی بەرامبەرەکەشی کوێر کردووە!

جا ئێمە کاتێك سەرنجی گیروگرفتەکانی چەندژنیی دەدەین‌و، بەراوردیان دەکەین لەگەڵ ئەو هەموو دەرەنجامە شووم‌و خراپانەی کەلـە بەدیلـەکانی دەکەونـەوە، بـێ

سێو دوو دانی پێدادەنێین‌و دەیسەلمێنین، كە هەرچۆن بێ گیروگرفتەكانی چەندژنیی كەمترو سێناترن، لەوەی كە لەبەر ڕەتكردنەوەی چەندژنیی بەناچاریی ئەو هەموو كارەسات‌و گرفتارییە ترسناكانە تەحەممول بكەین، كە لە بەدیلەكانیەوە پەیدادەبن، سەرەڕای ئەوەی كە هەموو ئەو بەرژەوەندییانەی، كە لە ڕێی چەند ژنییەوە دەستگیرمان دەبن، لە دەستمان دەچن! هەڵبەتە ئێمە خوا پشتیوان بێ لە خاڵی حەوتەمدا سەرنجی بەدیل (ئەلتەرناتیڤ)ەكانی یاسای چەندژنیی‌و ئەو دەرەنجام‌و كارەساتانەی لێیان دەكەونەوە، دەدەین، بۆیە لێرە باسیان ناكەین.

ئێستاش نۆرەی خاڵی شەشەمە، كە تێیدا باسی ئەو ڕاستییە دەكەین كە نابێ بەهەڵە بەكارهێنانی هەق، هەقمان لەلا ناشیرین بكات:

## ٦- بە هەڵە بەكارهێنانی هەق، نابێ هەقمان لەبەرچاو بخات:

گەلێك كەس ئەو كەم‌وكوڕیی‌و هەڵەو پەلانەی كە لە هەندێك لەو پیاوانە پشكووتوونەوە كە زیاتر لە هاوسەرێكیان هەیە، دەكەنە بەڵگەی نابەجێ بوونی یاسای چەندژنیی! بەڵام بێگومان ئەوە هەڵوێستێكی هەڵەشەو عاتیفیانەیەو، ئەگەر بەو لۆژیكە مامەڵە بكەین دەبێ زۆر شتی دیكەش ڕەتبكەینەوە، بۆ نموونە:

دەبێ نوێژیشمان لەبەرچاو بكەوێ، چونكە نوێژكەری وا زۆرن-لەم ڕۆژگارەدا- كە نوێژەكەیان، وەك خوا سبحانه‌و تعالی فەرموویەتی: ﴿... إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ... ﴿٤٥﴾ العنكبوت﴾، واتە: بێگومان نوێژ خاوەنەكەی لە شتی دزێوو خراپ دەگێڕێتەوە، لە خراپەو هەڵەو پەلە نایانگێڕێتەوە!

هەروەها ڕۆژوو گرتن‌و حەج‌و عومرەو قورئان خوێندن‌و زیكرو... هتدیش بەهەمان شێوە، هەروەها ئەگەر بەپێی ئەو لۆژیكە ڕەفتار بكەین، دەبێ زۆرێك لە دروشمە باوەكانی ئەم سەردەمەش هەر لە سۆنگەی ئەوەوە كە بەدرۆ بەرز

دەکرێنەوەو چەواشەکارییان بەناوەوە دەکرێ، ڕەفز بکەین: وەك:

دیموکراسی، ئازادیی، مافی مرۆڤ، دادگەریی، یەکسانیی، سەروەریی یاسا... هتد!

بەڵام وەك پێشتر گوتمان: ڕاست ئەوەیە کە ئەگەر شتێك لەخودی خۆیدا هەقو ڕاست بوو، نابێ بەهەڵەو ناهەقو بۆمەبەستی خراپ بەکارهێنانی، لەبەرچاومان بکەوێو، ئێمەش خۆمان توشی ستەم بکەینو، سەرەنجام ئەو هەقە دووجار ستەمی لێبکرێ:

یەکەم: لەلایەن ئەو کەسانەوە کە بەهەڵەو ناڕاست بەکاریان هێناوە.

دووەم: لەلایەن ئێمەوە، کە بەهۆی بەهەڵەو ناڕاست بەکارهێنرانیەوە، ڕەفزمان کردوە!

ئنجا وەك پێشتر چەند جارێك باسکرا، کە لە خۆڕابینینی بابای چەندژنهێن (مُعَدِّد) کە دادگەربێت لە نێوان هاوسەرەکانی داو بەلای هیچ کامیاندا دانەشکێو لارنەبێ، مەرجی بۆ ڕەوا بوونیەتیو، ئەگەر مەترسی هەبێ کە ناتوانێ دادگەربێ لەنێوان ژنەکانیدا، لە هەموو ئەو شتانەدا کە بەیەکدەنگیی زانایان دادگەر بوونی پیاویان تێدا بەمەرج گیراوە، بەتایبەت: مەسرەفکێشانو بەرگو پۆشاكو جێگاو ڕێگاو شەولامانەوە (النفقة والكِسوَة والسُّكْنى والمَبيت)، ئەوە بۆی نیە ئەو هەنگاوە بنێو لەسەری گوناهبار دەبێو، ڕێ لێگیرانیشی لەلایەن دەسەڵاتەوە ڕێی تێدەچێ، چونکە بێگومان کەسێك لێیەوە دیاربێ، کە ناتوانێ دادگەریی لەنێوان چەندژنێكدا بکات، دیارە بەرەو ستەمو خراپە هەنگاو دەنێو، لەسەر مسوڵمانانیش پێویستە لە هەموو ئاستەکانی تاكیو خێزانیو کۆمەڵگاو دەوڵەتدا، کە پێکەوە هاوکارو دەستبارگری چاکەو خێربنو، یەکدی لە خراپەو ستەم بگێڕنەوە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

**((ان الناس اذا رأوا الظالم فلم يأخذوا على يَدَيْـه أَوْشـكَ أَنْ يَعُمَّهُـمُ الله بعقـاب منه))** رواه أبـوداود والترمـذي والنـسائي عـن أبـي بكـرٍ الـصديق رضـي الله عنـه بأسانيد صحيحة، واتە: بەڕاستی هەرکات خەڵکی بابای ستەمکاریان بینیو دەستیان نەگرت، زۆر نزیکە کە خوا بەگشتی سزایان بدات.

هەروەها فەرموویەتی:

**((أُنصر أخاك ظالماً أومظْلوماً، فقال رجل: يارسول الله! أَنْصُرُهُ إذا كان مظلوماً، أرأيت إنْ كان ظالماً فكيف أنْصُرُهُ؟! قال تَحْجِزُهُ أو تمنعه من الظلم فأن ذلك نَصْرُهُ))** رواه البخاري عن أنس بن ملك ﵁، واتە: پشتی برایەکەت بگرە ستەمکاربێ، یان ستەملێکراو! پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر ستەملێکراو بێ پشتی دەگرم، بەڵام ئایا ئەگەر ستەمکاربێ چۆن پشتگیریی بکەم؟! فەرمووی: لە ستەم لای دەدەی یان ڕێگری لێدەکەی، ئائەوە پشتگیرییەتی.

کەواتە:

بە پێی فەرمانی خوا عزّوجلّ: ﴿...فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ فَوَٰحِدَةً ...﴿٣﴾ النساء﴾، کەسێك لە خۆی ڕانەبینێ، کە دادگەر دەبێ لەنێوان ژنەکانیدا، بۆی نیە بەرەو چەندژنیی هەنگاوبنێ، وە بەپێی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە دووانیانمان بە نموونە هێنانەوە، ڕێی تێدەچێ کە کۆمەڵگاو دەوڵەتیش بۆیان هەبێ، ڕێگریی لە بابایەك بکەن لە ژنێك زیاتر بێنێ، کە لێی دڵنیان -بەحوکمی ئاشنایەتییان پێی- ناتوانێ دادگەربێ.

ئنجا با بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی چەمكو واتای دادگەریی، گوێ بۆ چەند فەرموودەو شوێنەوار (أَثر)ێك بگرین:

١- **((عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان رسولُ الله ﷺ لايُفضِّلُ بَعْضَنا على بعضٍ، في القَسْم من مُكثِهِ عندنا، وكان قلَّ يومُ إلاّ هو يطوف علينا جميعاً،**

**فَيَدْنو من كل امرأة من غير قسيسٍ حتى يبلغ التي هو يومها فيبيت عندها))** رواه أحمد وأبوداود والحاكم والبيهقي، واتە: پێغەمبەر ﷺ لە دابەشکردنی لەلامانەوەماندا زێدەیی نەدەدا بەهیچ کامان بەسەر ئەوانی دیکەدا، وە کەم ڕۆژ هەبوو کە بەسەر هەموومانەوە نەگەڕێ، ئیدی خۆی لەهەرکامێك لەژنەکان نزيك دەکردەوە، بێ ئەوەی بچێتەلای (سەرجێی بکات) هەتا دەگەیشتە لای ئەوەیان، کە نۆرە شەویەتی‌و لەلای دەمایەوە.

٢- **((عن عائشة رضي الله عنها: ان النبي ﷺ كان اذا أراد سفراً أَقْرع بين أزواجِه، فأيَّتهُنَّ خرج سَهْمُها خرج بها معه))** متفق عليه، واتە: پێغەمبەر ﷺ هەرکات دەچووە سەفەرێ قورعە (تيروپشك)ی لە نێوان ژنەکانی‌دا دەکردو، هەرکاميان قورعەی بۆ دەرچووبایە سەفەری پێدەکرد.

٣- **((عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان رسول الله ﷺ يَقْسِمُ فَيَعْدِلُ ويقول: أللهم هذا قَسْمي فيما أمْلِكُ، فلا تَلُمْني فيما تَملِكُ ولا أملِكُ))** رواه أبوداود والنسائي والترمذي، کە پێشتریش هێناومانەو ماناشمان کردوە.

٤- (جابر بن زيد) گوتوويەتی[١]: (دوو ژنم هەبوون لەنێوانيان‌دا دادگەرييم دەکرد، تەنانەت لە ماچککردنيشياندا).

٥- (مجاهد) گوتوويەتی: ئەوان (واتە هاوەڵان) حەزيان دەکرد، کە تەنانەت لەبۆنی خۆشيش‌دا دادگەريی لە نێوان ژنان‌دا بکەن، وەك چۆن بۆ ئەميان خۆی بۆنخۆش دەکرد، بۆ ئەميشيان خۆی بۆنخۆش دەکرد)[٢].

٦- (ابن سيرين) گوتوويەتی: (شتێکی ناپەسندە، کە مێرد لە ماڵی يەکێك لە دوو ژنەکانی‌دا دەستنوێژ بگرێ‌و، لەويديکەيان‌دا نەيگرێ!)[٣].

---

١) بڕوانە: (يسألونك ليزدادوا إيماناً)، ص٦٥، إبراهيم النَّعمة.

٢) سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

٣) سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

كــەواتە:

لە كاتێكـدا كـە دەبیـنین یـەكێك ئـەم یاسـا شـەرعییەی چـەندژنییە بەهەڵـە بەكاردێنیێو، خۆی دووچاری ستەمكارییو خراپەی زۆر دەكات، بارِەخنـە لـەخودی ئەو كەسەو ڕەفتارە ناشەرعییەكەی بگرین، نەك بەناهەق یەخەی ئیـسلامو یاسـاو بڕیارەكانی بگرینو، باجی هەڵەو لادانی مسوڵمانانی لار، لـەئاینو بەرنامـەی بـێ هەڵەو پەڵەی خوای پەروەردگار بستێنین!

ئێستاش نۆرەی خاڵی حەوتەمی ئەم بابەتەیـە، تـاكو بـزانین ڕەخنـە گـران لـە چەندژنیی، بەدیلیان بۆ چەندژنیی چییە؟!

## ٧- ئایـا ڕەخنـەگـران لە یاسای چـەندژنیـی بەدیلـیان چـیە؟!

بێگومان بۆ ڕەخنە لێگرتنی یاساو بڕیارێكو ڕەتكردنەوەی، مەدار بەس بەوەندە ساز نابـێ، كـە كـەموكووڕییو دەرهاویـشتە خراپـەكانی بخرێنـەڕوو، بـەڵكو وەك پێشتریش گوتمان كە كەسێك بە جیددیی عـەودالی چارەسـەركردنی كێـشەو گـیرو گرفتەكانی كۆمەڵگایەكەی بێ، نەك تەنیا قسە فڕێدانو موزایـەدەی بـۆش بەسـەر ئەمو ئەوەوە كردن، پێویستە هاوكات لەگەڵ سەرنجدانی ئەو یاساو بڕیارەی ڕەخنەی لێـدەگرێو، كەموكووڕییـەكانیی دەژمێـرێ، ئـاوڕیش لـە بەدیلەكـەی یـان لـە بەدیلەكانیشی بداتەوەو تێیانەوە ڕامێنێو، پاشان ئەو بەدیلە یـان ئـەو بەدیلانـەو ئەو كەموكووڕییو دەرهاویشتە خراپانەی لێیانەوە سەر هەڵـدەدەن، لەگـەڵ یاسـاو بڕیارەكەدا بەراورد بكاتو، سـەرنج بـدات داخـۆ كـەمو كـووڕییو دەرهاویـشتەی خراپی كامیان زیاترەو هی كامیان كەمترە؟ بـۆ ئـەوەی بـەپێی حـوكمی عـەقڵو بنچینەی شـەرعیی: (إحتمـال أخَـفَّ الـضررين لأِبعـاد أَشـدِّهما) (تەحـەمولكردنی سووكترینی دووزیانەكان بۆ دوور خستنەوەی قورسترینیان)، كامیـان زیـانو بـاجی كەمتر بوو ئەوەیان هەڵبژێرێ.

دەجا با لەسەر ئەم بناغەیە سەرنجی یاسای چەندژنییو بەدیلەكانی بدەین، بزانین لە ئەنجامی پێكەوە بەراورد كردنیاندا چی دەبینین؟!

وەك پێشتر باسمان كرد:

هەرچەندە خێزانی چەندژنیی كەمو زۆر گیروگرفتو نارەحەتی هەردەبن، بەلاّم بەئەندازەی ئەوە كە هەركام لە پیاوو ژن لە پەروەردەو ئاراستەی ئیمانییو ئیسلامیی بەهرەمند دەبنو، پیاو لە ڕووی دادگەربوونییەوە لە نێوان ژنەكانیدا لە خۆی وریا دەبێو، ژنەكانیش ڕەچاوی ڕەوشتو ئەدەبەكانی ئیسلامو سنوورەكانی شەرع دەكەن، ڕێژەی ئەو گیروگرفتانە كەم دەبێتەوەو تەباییو ڕێزو خۆشەویستیو هاوكاریی زیاد دەكات.

بەلاّم ئایا هەرچۆن بێو لە هەموو حالاّندا، گیروگرفتو دەرهاویشتەی خراپو سەرئێشەكانی چەندژنیی هەر كەمترنین لە هی بەدیلەكانی؟! بێگومان با، چونكە:

یاسای چەندژنیی -كە وەك لە خالّی چوارەمداو لەكاتی خستنە ڕووی حیكمەتو پاساوەكانی باسمان كرد، تاكە دەروازەیەكە بۆ لێوە دەرباز بوونی كۆمەلّێك لە پیاوانو ئافرەتان، لە چەند قەیرانو گرفتێكی گەورە -تەنیا دوو جۆرە بەدیلی هەن، واتە: هەر كۆمەلّگایەك ئەو یاساو چارەسەرەی بەدەستەوە نەبێ، ناچارە یەكێك لەدوو ڕێیانە هەلّبژێرێ، بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەلّ ئەو قەیرانو گرفتانەی كۆمەلّێك لە پیاوانو ئافرەتاندا، كە پێشتر باسمان كردن:

یەكەم: ئارام گرتنو خۆكپ كردنەوەو خۆ كۆنترۆلّكردن هەتاكاتی مەرگ، یان ئایندەیەكی نادیار.

دووەم: پەنابردنەبەر زیناو داوێن پیسیی.

ئنجا بە ئەزموونیش دەركەوتوە، كە كاتێك مرۆڤەكان -چ نێر چ مێ- دەكەونە نێوان ئەو دوو ئەگەرەوە، بێجگە لە كەسانێكی كەمی خاوەن ئیرادەی بەهێز -كە ڕێژەكەیان لە كۆمەلّگایەكەوە بۆ كۆمەلّگایەكی دیكە دەگۆڕێ- زۆربەیان ئەگەری

دووەم هەڵدەبژێرن‌و بۆی پەلکێش دەکرێن، بەتایبەت لەکاتێکیش‌دا کە هۆیەکانی ڕاگەیاندن ڕۆڵێکی کاریگەر دەگێڕن، لە پەرەپێدانی بێ بەندوباریی‌و ڕەوشت نزمیی‌و، ئاسانکردن‌و ڕازاندنەوەی خراپەو تاواندا.

کەواتە:

لەڕاستی‌دا ئەگەر ڕوون‌و ڕاشکاوانە قسە بکەین، دەبێ بڵێین، هەرچەندە بەشێوەیەکی تیۆریی (نظري) چەندژنیی دوو بەدیلی هەن، کە یەکەمیان خۆڕاگریی (صبر)و خۆ مەرزەم کردن‌و خۆکپکردنی ژمارەیەکی زۆر لە پیاوان‌و ئافرەتانی کۆمەڵگایەو، ئەویدیکەشیان زیناو داوێن پیسیی‌یە، بەڵام بەکردەوەو لە دنیای واقعدا، بەدیلی چەندژنیی -مەگەر بەدەگمەن- دەنا هەر زیناو داوێن پیسییە، چونکە غەریزەی جنسیی یەکێکە لە غەریزە هەرە بەهێزەکانی مرۆڤ‌و بەرهەڵستی کردنی زەحمەتە، بەتایبەت -وەك گوتمان- لە کۆمەڵگایەكدا کە بەردەوام هۆکارەکانی ورووژاندن (إثارة)ی ئەو غەریزەیەی تێدا زیاد دەکرێن، لە هۆیەکانی ڕاگەیاندن‌و، کلیپ‌و، گۆرانیی بێ‌شەرمانەو، بەرگ‌و پۆشاکی مێینایەتی بەرجەستەکەرو...هتد.

هەربۆیەش:

ئەگەر ویستمان حەقیقەتی یاسای چەندژنیی‌و پێویست بوون، یان پێویست نەبوونیمان بۆ دەربکەوێ، دەبێ هەڵسین بە بەراوردکردنی چەندژنیی‌و زیناو داوێن پیسیی، کە تاکە بەدیلی کردەیی‌و واقیعی چەندژنییە، نەك بێنین بەراوردی نێوان یەکژنیی‌و چەندژنیی بکەین!

چونکە هیچ کەس نکوولێی لەوە نیە، کە حاڵەتی یەکژنیی سەلامەتترو سێناترو کەم گرفتترە، بەڵام مەسەلە ئەوەیە کە ئایا لەکاتێكدا -لەبەر ئەو پاساوانەی لە خاڵی چوارەم‌دا خرانەڕوو- چەندژنیی خۆی فەرز دەکات‌و ناچار دەبین پەنای پێبەرین: چەندژنیی گیروگرفت‌و سەرئێشەی کەمترن، یان زیناو داوێن پیسیی؟!

جا دیارە ئێمە لەكۆتایی خاڵی یەكەمی ئەم بابەتەدا، چوار جیاوازی زەقمان لەنێوان چەندژنیی‌و زیناكردندا -بۆ كەسانێك كە خۆیان بە مسوڵمان نازانن - خستۆتە ڕوو، بۆیە لێرەدا بەگوتنی ئەم چەند دێرەی خوارێ، واز لەم مەسەلەیە دێنین:

هەركەسێك دەیەوێ بەچاوی سەرو لە دنیای واقعدا زادەو دەرهاویشتەكانی ڕێگرتن لە چەندژنیی‌و كارەساتەكانی تاكە بەدیلەكەی، كە زیناو داوێن پیسییە ببینێ، با سەرنجێكی بارودۆخی خێزانیی‌و كۆمەڵایەتی ولاتانی ڕۆژئاوا بدات، تاكو ببینێ كە:

١- لە هەندێك یان زۆربەی ئەو وڵاتانەدا ڕێژەی منداڵی زۆڵ (أولاد لزِّنا) لەهی ئاسایی زیاترە.

٢- هەروەها ڕێژەی تەڵاق‌و لەیەكترازانی ژن‌و مێردو لەیەك هەڵوەشانەوەی خێزان، لە هەندێك لەو وڵاتانە یان زۆربەیاندا گەیشتۆتە نیوەو بەردەوامیش لە زیادبووندایە[١].

٣- زۆر بەخێرایی ڕێژەی تووشبووانی نەخۆشیەكانی (ئیدز aids)و (هەرپس herpes)و (سەیلان gonorrhea)و (زوهری syphilis)و (بالووكەی كۆئەندامی زاوزێ gonial warts)و (هەوكردنی جگەریی ڤایرۆسی بی viral hepatieasB)، كە هەموویان نەخۆشی كوشندەو خراپن، بەرەو زیادبوون دەچێ، دیارە سەرجەم ئەم نەخۆشیانەش لە ئەنجامی كارە جنسییە ناشەرعییەكانەوە پەیدا دەبن، كە ساڵانە ملیۆنان كەسیان پێ لەنێو دەچێ[٢].

---

١) بڕوانە: (مكانة الأسرة بين البناء الأسلامي والبناء الغربي) الشيخ راشد الغنوشي، المجلة العلمية للمجلس الأوربي للأفتاء والبحوث. ص١٩-٥٠.

٢) بڕوانە: (الجنس والتربية الجنسية في ضوء الشريعة الأسلامية) د.محمد الهواري، المجلة العلمية للمجلس الأوربي للأفتاء والبحوث، ص(٦٧-١٣٠).

کـــەواتە:

ئایا هەرکەسێك ئیمانو عەقڵ، یان لای کـەم یـەکێکیانی هـەبێ، ڕێ بـەخۆی دەدات کـە لـەنێوان چـەندژنییو زینـاو داوێـن پیـسیی‌دا، زینـاو داوێـن پیـسی هەڵبـژێرێ، یـان تەنانـەت وەك یەکیـشیان سـەیر بکـاتو پێکـەوە بیانخاتـە تەرازووێکەوە؟!

لە کۆتایی ئەم خـاڵەشدا دەڵێیـن:

لە ڕاستی‌دا ئـەوەی کەئێـستاکە لـەوڵاتی ئێمـەدا لەلایـەن هەنـدێك کەسـەوە بەشێوەیەکی تیۆریی بانگەشەی بۆ دەکـرێ، کـە بریتیـە لـە ڕێگـرتن لـە یاسـای چەندژنیی، ئەنجامو بەرهەمەکەی بە بەرجەسـتەکراوی لـەو وڵاتانـەدا دەبیـنین کـە ئاینەکەیان یەکژنیی لەسەر پێویست کردوون، کە بریتیە لە بەشـێوەیەکی فـەڕمیی تەبەننی کردنی زیناو داوێن پیـسیو نێربـازییو خـۆ لەیەکخـشاندن (مُـساحقة)و لەگەڵ ئاژەڵدا جووتبوون!!-، کەواتە:

ئەو جۆرە کەسانە بزانن، یان نەزاننو بیانەوێ یان نا، بە هەوڵدانیان بۆ ڕێگـرتن لە چەندژنیی، کار لەسەر پەرەپێدانو تەشەنەکردنی ئەو نەخۆشییو دیاردە دزێوانە دەکەن، کە ئێـستاکە وەك ئـاگری نێـو پـووش کەوتوونەتـە نێوجەسـتەی خـەڵكو دانیشتوانی وڵاتانی ڕۆژئاواو هاووێنەکانیان!

هەڵبەتە دەشزانم کە ڕێگرتن لە چەندژنیی تەنیا یەکێکە لەو هۆکارانەی کە ئەو وڵاتانەیان بەو دەردە بردووەو، وێڕای ئەوە هۆکاری دیکەش هەن، هـەروەها ناشـڵێم بە یاسای چەندژنیی سەرجەم گرفتو قەیرانەکانی کۆمەڵگاکەمان چارەسەر دەبـن، چونکە هەر دەردو نەخۆشییەك چارەسەری خۆی هەیە! بەڵام بێگومان چـەندژنییش نەك هەر گرفتو کێشە نیە، بەڵکو دەروازەیەکیشە بۆ چارەسەری گرفـتو کێـشەی ژمارەیەك لـە پیـاوانو ئافرەتـانی کۆمـەڵگاکـەمان، لەنێویـشیاندا هەنـدێك لـەو ئافرەتانەی کە بەر لەوەی پەکیان لەسەر چەندژنیی بکەوێ، یان بۆیـان هەڵکـەوێ،

زۆر دژایەتییان کرد، بەڵام دوایی پەندی (هەتا نەینا لەتەبەق نەیگوت صەدەق)یان بەسەردا چەسپی‌و، سەرەنجام ئەوەی شەریعەت فەرموویەتی‌و، فیطرەت‌و واقع دەیخوازن، هاتەدی‌و پێچەوانەکەیشی بوو بەهەڵم!

## ٨- نە پیاوسالاریی نە ژنسالاریی، بەڵکو شەرعسالاریی:

سەرەتا ئەوە ڕوون دەکەمەوە، کە لێرەداو لە سەرجەم باس‌و بابەتەکانی ئەم لێکۆلینەوەیەدا، کە وشەی (شەرع)م بەکارهێناوە مەبەستم پێی شەریعەتی خوایە کە لە قورئان‌و سوننەتدا بەرجەستەیە، نەك (فقە)، کە بریتیە لە بەرهەم‌و کەلەپووری زانایان‌و جۆری تێگەیشتن (فهم)یان بۆ شەریعەت.

پاشان دەڵێم:

ئەوە کە ئایا پێویستە پیاو سالارو بالادەست بێ‌و، قسەی کۆتایی بەدەست بێ، یان ئافرەت؟!

لەم ڕۆژگارەدا مشتومڕو بێنەوبەردەی زۆری لەسەرە، جا ئایا هەڵوێستی ڕاست‌و دروست بە بۆچوونی ئێمەو لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا، لەوبارەوە چی‌یە؟!

بەر لەهەر شتێك پێویستە لە مەسەلەیەکی گرنگ بێئاگا نەبین:

ئەویش ئەوەیە، کە زۆر بابەت لەنێو ئێمەی مسوڵماندا -کوردو غەیری کورد- دەورووژێنرێن‌و باس‌و خواسی گەرمیان لەسەر دەکرێ‌و، خەڵکیان پێوە سەرقاڵ دەکرێ، بەڵام ئەگەر بەوردیی‌و واقیع بینی سەرنجیان بدرێ، دەزانرێ کە ئەو بابەتانە هەڵقولاوو زادەی واقیعی کۆمەڵگای ئێمە نین‌و، وەك زۆر شتی دیکە، بە پاڵنەریی لاسایی کردنەوەی کوێرانەوە هێنراونە نێومانەوەو پێیانەوە سەرگەرم کراوین!

جا یەکێك لەو بابەتانە، ئەم بابەتەی ساغکردنەوەی بالادەستێتی‌یە لەنێوان نێرو مێ‌دا، کە ئایا دەبێ کامیان بە قسەی کامیان بکات؟!

ئاشكراشە كە هۆی سەرهەڵدانی ئەم كێشەیە لە ڕۆژئاوادا، ئەو دژایەتیی‌و ناكۆكی‌یە بوو، كە لە سۆنگەی چەوسێنرانەوەو ئیستیغلال كران‌و ماف پێشێلكرانی ئافرەتان لەلایەن پیاوانەوە پەیدابوو، كە دیارە ئەمەش بەسەرهاتێكی دوورو درێژەو لە قەرەی ئەم لێكۆڵینەوەیەدا نیە كە بەدوای بكەوی‌و بچێتە بنج‌و بناوانیەوە، تەنیا مەبەستم ئەوە بوو ئاماژە بكەم بە ڕیشەو چاوگی پەیدابوونی ئەو بابەتەو دەرككردنی ئەو ڕاستییە كە كێشەو ململانێی نێوان نێرو مێ، هیچ پەیوەندییەكی بە ئیسلام‌و مسوڵمانانەوە نیەو، كێشەو نەخۆشییەكە كە لە ڕۆژئاواوە بۆمان هێنراوە!

ئنجا ئایا ئیسلام هەڵوێستی لەباری پیاوسالاریی‌و ژن سالارییەوە چی‌یە؟!

هەر بەكورتی دەڵێین:

لە ئیسلام‌دا جووتێتی (زوجیة) بنچینەی گشتی دروستكراوەكان (مخلوقات)ەو، ئەوە تەنیا خوایە عزّوجلّ، كە تاك (وَتـرْ)و بێنیازو بێ‌وێنەو هاوەڵ‌و هاوتایە: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾ الإخلاص﴾، خوای بەرزو مەزن لەبارەی جووتێتی تێكڕای دروستكراوەكانییەوە، فەرموویەتی: ﴿وَمِن كُلِّ شَىْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ الذاريات﴾، واتە: وە لە هەموو شتێك جووتێكمان دروست كردوە، بەڵكو پەند وەربگرن (كە جووتە پێویست بە یەكبووەكان پەكیان لەسەر بەدیهێنەرێك كەوتوە).

كەواتە:

ئەوە تەنیا ئافرەت‌و پیاونین، كە وەك جووت (زوج) دروستكراون، بەڵكو بنچینەی جووتێتی (قاعدة الزوجية)، بنچینەی گشتی سەرجەم دروستكراوەكانە، بە ژیاندارو بێ ژیان‌و وردو درشت‌و بینراوو نەبینراوەوە!

ئاشكراشە كە زانینو دەرككردنی ئەم ڕاستیە، كە نێرو مێ بە هەردووكیان جووت (زوج)ێك پێكدێننو هیچ كامیان بەبێ ئەوی دیكە بوونی ناكرێو ناگونجێ بەردەوام بێ، هەرچی سێبەرو وەهمی ناكۆكییو ململانێو دژایەتییە -لەنێوان نێرو مێدا- دەسڕێتەوە، بگرە زانینو دەرككردنی ئەو ڕاستییە هەر ڕێگەنادات ئەو جۆرە بیرۆكەو تەرزە وەهمو خەیاڵانە، لە دڵو مێشكدا دروست بن!

كەواتـــە:

لەبووناسی (معرفة الوجود)و دنیا بینی ئیسلامدا ئافرەتو پیاو وەك سەرجەم جووتەكانی دیكە، بەدژو پێچەوانەی یەكدی دانەنراون، تاكو ململانێی یەكدی بكەنو لەسەر بەسەر یەكدیدا باڵادەستو سالاربوون، ناكۆكییان بكەوێتە بەین، بەڵكو ئیسلام پیاوو ئافرەتی بە تەواوكەری یەكدی داناونو، هەردووكیانی وەك دوو لەتك (شقّ)ی سێوێك تەماشا كردوە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: **((إِنَّما النِّساءُ شقائق الرِّجالِ))** رواه أحمد وأبوداود والترمذی وهو صحيح، واتە: بێگومان ئافرەتان لەتكی پیاوانن!

ئنجا هەركام لە پیاوانو ئافرەتانی مسوڵمان، بە حوكمی ئیمانیان بە خوای پەروەردگارو ئایینو بەرنامەكەی، ملكەچی خواو پابەندی بەرنامەكەینیو، هەموویان شەریعەتی خوایان كردۆتە سایەو سالاری خۆیانو، هیچ پیاوێكی بڕوادارو هیچ ئافرەتێكی بڕوادار، ڕێ بەخۆی نادات كە لە بەرانبەر یاساو بڕیارەكانی خواو پێغەمبەردا، لامو جیمی بكاتو مافی سەر پشك بوون بەخۆی بدات، وەك خوا سبحانه وتعالی فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ الأحزاب﴾، واتە: هیچ پیاوێكی بڕوادارو ئافرەتێكی بڕوادار، بۆیان نیە هەركات خواو پێغەمبەرەكەی بڕیارێكیاندا، لەبارەی خۆیانەوە سەر پشك بن، وە هەركەسێك سەرپێچی لە خواو پێغەمبەرەكەی بكات، ئەوە بێگومان بە

گومڕاییەكی ڕوون گومڕا بووە.

بەڵێ پەیوەندی پیاوانو ئافرەتان لەئیسلامدا، نە لەسەر بناغەی ململانێو نە لەسەر بناغەی سەردەست بوونو بندەست بوون بنیات نەنراوە، بەڵكو لەسەر بناغەی دۆستو پشتیوانی یەكدی بوونو، پێكەوە هاوكاریی كردنو دەستبارگرتن، بنیات نراوە، وەك خوای پاكو تاك فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ...﴿٧١﴾ التوبة﴾.

جا لێرەدا ڕەنگە یەكێك بڵێ:

ئەدی ئەوە نیە لە قورئاندا هاتوە: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ...﴿٣٤﴾ النساء﴾.

كەواتە: چۆن دەگونجێ بڵێین: لە ئیسلامدا پیاو سالاریی‌و ژنسالاریی نیە، بەڵكو شەرعسالاریی هەیە؟!

وەلامیش ئەوەیە كە:

یەكەم: وەك لە بەشی یەكەمی ئەم لێكۆڵینەوەیەدا ڕوونمان كردۆتەوە سەرپەرشتیارێتی پیاو بۆ ژنو ماڵ ئەركو بەرپرسیارێتیەكی قورسە، كە خراوەتە ئەستۆی پیاوەوەو، هیچ زێدەیی‌و ئیمتیازێكی تێدانیەو بارو (تكلیف)ە، نەك خەڵاتو (تشریف)!

دووەم: ئەوە كە شەریعەت ئەركی سەرپەرشتیارێتی ژنو ماڵی بەپیاو سپاردوەو، چەند ئەركێكی دیكەی تایبەتی بەهەركام لەژنو پیاو سپاردوە، لەسۆنگەی ئەوەوە، كە شەریعەت سەرچاوەی دیاریكردنی ئەركو كارەكانەو، هیچ كام لە پیاوو ئافرەت كەمو زۆر دەوریان تێدانیە، بۆیە سەرەنجام سەروەریی‌و باڵادەستییەكە هەر هی شەریعەتە، چونكە هەردووك ڕەگەزەكە پێویستە وەك یەك بۆی ملكەچ بن، بەكورتی: كاتێك پیاو لەچوارچێوەی خێزاندا سەرپەرشتی

ژنو ماڵەكەی دەكات، بەپاڵنەری جێبەجێكردنی ئەركی سەرشانیو بەندایەتی كردنی بۆ خوا عزّوجلّ ئەوە دەكات، نەك بەهاندەری كوێخایەتی بەسەر ژنو ماڵداكردن، هەروەها كە ژنیش ئەركە سروشتییەكانی خۆی لەجوغزی ماڵو مێردیدا جێبەجێ دەكات، وەك: شیر پێدانی كۆرپەكانیو كابانیی كردنو بەقسەی مێرد كردن، بەپاڵنەری بەندایەتی بۆ خواو پابەندیی بەشەریعەتەوە ئەوە دەكات، نەك لەژێر فشاری سالارو سەروەر بوونی پیاوەكەیدا، كەواتە:

سەرەنجام سەروەرییو سالاریی لەژیانی هەردووك ڕەگەزەكەدا بۆ ئایینو شەریعەتی بێ هەڵەو پەڵەی خوای كاربەجێ دەگەڕێتەوە.

ئێستاش نۆرەی خاڵی نۆیەمی ئەم بابەتەیە:

## ٩- چەند قسەو بۆچوونێكی كرچو كاڵو هەڵەی، ڕەخنە لێگرانی چەند ژنیی:

بەپێویستی دەزانم لەم خاڵی نۆیەمەدا ئاماژە بۆ هەندێك قسەو بیرو بۆچوونی كرچو كاڵو نامەنتیقی ژمارەیەك لەوانە بكەم، كە بەحیساب بۆ بەرگریی لە ئافرەتو مافەكانی، دژایەتی یاسای چەندژنیی دەكەن، بەلام دیارە بەبێ ناو هێنانی هیچكەسو هیچ بلاوكراوەیەك:

### یەك: هاندانی ئافرەتان لەدژی ئیسلامو پیاوو كۆمەڵگا:

ئەوە كە لەژێر پەردەی ئیسلامو شەریعەتدا هەندێك لە پیاوان —چ وەك بابو برا، چ وەك مێرد- ستەمیان لەئافرەت كردوەو دەكەنو كۆمەڵگاش بێدەنگ بووە، شتێكی ڕاستو نكوولّیی لێنەكراوە، بەلام وەك پێشتریش گوتمان: ڕەوا نیە هەڵەو كەمو كووڕییو لادانی مسوڵمانان —هێندێكیان، یان زۆربەیان- لەسەر ئیسلام حیساب بكرێ، لەحاڵێكدا كە لەچەندان دەقی ڕوونو ڕاشكاوی ئیسلامدا، بەپێچەوانەو دژی ئەو ڕەفتارو هەڵسوكەوتە هەڵەو لادەرەوانەوە ڕێنماییان كراوە!

ئنجا ئایا بە سەنگەر لە یەكدی گرتنو، بەرە (جبهة) بەرانبەر بە یەكدی دروستكردنی ژنانو پیاوان، گرفتو كێشەكانی ئافرەتان چارەسەر دەبن؟! وە ئەگەر گریمان ئافرەتان بەوە كە ملیان پێ لەبەرملی پیاوان دەنرێو، بەگژیاندا دەكرێن، گرفتو كێشەكانیشیان چارەسەر بن، ئایا هیچ گرەنتی (ضمانة)یێك هەیە، كە ئافرەتان لەو ملبەملەو زۆرانبازییەدا تێناشكێنو نادۆڕێن؟!

پاشان بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە، كە لەلایەكەوە بانگەشەی وەك یەكبوونی نێرو مێ- نەك یەكسانییان لە مرۆڤایەتیو ئازادییو مافدا، كە ئیسلام دەیڵێ- بكرێو بەو بۆنەیەشەوە وشەی (جێندەر - Gender) تووتی ئاسا بە دەمەوە بگیرێ، كە وشەیەكی مانا تەمو مژاوییو لێڵە، وەلەلایەكی دیكەشەوە دروشمی توندو تیژیی نەنواندنی پیاو بەرانبەر بەئافرەت، بەرز بكرێتەوە! چونكە:

مادام ئافرەتو پیاو لە هەمووشتێكدا وەك یەكنو، هیچ جیاوازییەكان نیە، ئەدی بۆچی بەدرێژایی مێژوو و لەسەرجەم كۆمەڵگایەكاندا، هەر ئافرەتان زاڵەو ناڵەیان بووە بەدەست پیاوانەوە؟ پاشان ئەگەر ڕاستە نێرو مێ لەیەك جیا نین، ئەدی هاوار هاواری ئافرەتان لەپیاوان كە توندوتیژییان بەرانبەر نەكەن! نابێتە قسەیەكی بۆشو بێ پاساو؟!

بۆیە لەوبارەوە هەر بەكورتی دەڵێم:

خوای زاناو شارەزا عزّوجلّ ڕوو بە پیاوانو ئافرەتان فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُوا ۖ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ ۚ وَاسْأَلُوا اللَّهَ مِن فَضْلِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾ النساء﴾، واتە: وە ئەو زێدەییو ئیمتیازەی، كە خوا بە هەندێكتانی داوە بەسەر هەندێكتانەوە، بەخۆزگە مەخوازن، پیاوان پشك (ی پاداشت)یان هەیە لەوەدا، كە وەدەستیان هێناوەو، ئافرەتانیش پشكیان هەیە لەوەدا، كە وەدەستیان هێناوە، وە داوای بەخششی خوا بكەن، بێگومان خوا بە هەموو شتێك زانایە.

ئەم ئایەتــە بــەپێزە وەك لــەهۆی هاتنــە خوارەوەیــەوە دیــارە، مەبەســت پــێ‌ی ئامۆژگاریی كردنی هەردووك ڕەگەزی نێرو مێیە، كە هــەركامێكیان بــە سروشــتی تایبەتی خۆی‌و، بەبەشی خوا ڕازی بێ‌و، چاو نەبڕنە ئەو زێدەیی‌و ئیمتیازانەی، كە خوای كاربەجێ لەڕووی چەندان حیكمەتەوە بەهــەركامێكیانی بەخــشیون، چــونكە هەركام لە (أحمد و ترمذي) لــەبارەی هــۆی هاتنــە خــوارەوەی ئــەم ئایەتــەوە ئــەم فەرمایشتەیان گێڕاوەتەوە[١]:

((عن أم سلمة رضي الله عنها قالت: يارسـول الله يغـزو الرجالُ ولا نغـزو، ولنـا نــــصف الميـــــراث! فـــأنزل الله: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ ...﴿٣٢﴾ النســاء﴾، واتە: ئوممو سەلەمە خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: ئــەی پێغەمبەری خوا پیاوان دەچنە جەنگ‌و ئێمە ناچین بۆ جــەنگ، وەنیــوەی میراتمــان هەیە! ئنجا خوا ئەمــەی نــاردەخوار: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ ...﴿٣٢﴾ النســاء﴾.

بەڵێ هەڵوێستی ڕاســت‌و دروســت‌و مــەنتیقی ئەوەیــە، كــە هــەركام لــەو دوو ڕەگەزەی نێرو مێ، بە ڕەگەزو سروشتی تایبەتی خۆیانیان شەرم نەبێ -بەتایبــەت ئافرەت-، وەهیچ كامیان لە بەرانبەر ئــەوی دیكــەدا هەســت بەكــەمیی نــەكات‌و بێهودە لەهەوڵی ئەوەدا نەبێ كە ئیسپاتی بكات، ئەویش وەك ڕەگەزەكــەی دیكــە وایەو هیچ جیاوازییان نیە، چونكە جیاوازیی نێــوان نێــرو مــێ‌ی مرۆڤــو غــەیری مرۆڤـ، لەوە زەقترو ئاشكراترە بشاررێتەوە.. وەبێگومان یەكسانی ئافرەت‌و پیاو لە مرۆڤبوون‌و بەندەی خوابــوون‌و ئــازادیی‌و ڕیــزو مافــەكاندا، هــیچ پــەكی لەســەر ئیسپاتكردنی وەك یەكبوون‌و، لەیەك جیاواز نــەبوونی نێــرو مــێ نەكــەوتوە، وەك پێشتر خستمانەڕوو.

---

١) بڕوانە: (المصباح المنيـر في تهذيب تفسيـر ابن كثيـر)، ص٢٨٩.

وە من دڵسۆزانە ئامۆژگاریی ئافرەتان دەكەم، كە فریوی ئـەو جـۆرە قـسەوقاڵە بۆش‌و بەتاڵانە نەخۆن، چونكە ئەگەر هەزار ساڵ خۆیان بـە دارو بـەردا بـدەن بـۆ ئیسپاتی جیاواز نەبوونیان لە پیاوان، جگە لە مانـدووبوونی بـەلاش هیـچیان پـێ نابڕێ‌و، دووبارەشی دەكەمەوە كە —لە ئیسلامدا- بۆ ئیسپاتكردنی یەكسانبوونیان لەگەڵ پیاواندا، لە مرۆڤبوون‌و بەندەی خوابوون‌و ڕێزو ئازادیی‌و مافـەكاندا، هـیچ پەكیان لەسەر ئیسپاتی ئەفـسانەی وەك یـەكبوونی ژن‌و پیـاو نەكـەوتوە، چـونكە ئیسلام نێرایـەتی (الـذكورة)و مێیایـەتی (الأنوثـة) نەكردۆتـە سـەنگی مەحـەكی مرۆڤەكان‌و، پێوەرو تەرازووی هەڵسەنگاندنیان، بەڵكو سەنگی مەحەك پارێزكاریی (تقوى)یە: ﴿... إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ... ﴿١٣﴾ الحجرات﴾.

كـەواتـە:

با هەركام لە پیاوان‌و ژنـان، لـەجیاتی ململانێـی بێ‌سـوود لەگـەڵ یەكـدیدا، لەبواری مەسەلە هاوبەشەكاندا خەریكی هاوكاریی‌و دەستبار بـۆ یـەكگرتن بـن‌و، لەبواری تایبەتمەندییەكانیشیاندا، پیاوان هەوڵی زیـاتر بەرجەسـتەكردنی پیـاوەتی یان‌و، ژنانیش هەوڵی زیاتر بەرجەستەكردنی ژنایەتی خۆیان بـدەن، بێئـەوەی هـیچ لایەك لاف‌و گەزاف بەسەر ئەوی دیكەدا لـێ بدات!

## دوو: پۆلێن كردنی نووسەرو سیاسـەتمەدارو پەرلەمانتارو... هتدەكان، بۆ چـاك‌و خـراپ، یـان پێـشكەوتنخوازو دواكـەوتوو، لەسـەر بنـەمای بیـروڕایان بۆ مەسەلەیەكی دیاریكراو:

ئەمیش یەكی دیكەیە لەو بیروبۆچوونە هەڵەو كرچ‌و كاڵ‌و فەقیر حاڵانەیەی، كـە ڕەخنەلێگرانی چەندژنیی دووچاری بوونە!

كە بێگومان شتێكی پـووچ‌و نامەنتیقییـە بێـنین پـۆلێن (تَـصْنیف)ی خـەڵكی بكەین بۆ چاك‌و خراپ، یان دڵـسۆزی ئافرەتـان‌و نادڵـسۆز، یـان پێـشكەوتنخوازو دواكەوتوو...هتد، لەسەر بنەمای هاوبیرو هاوهەڵوێست بوون، یـان نـەبوونیان لـە

بەرانبەر مەسەلەیەکی دیاریکراودا، ئنجا پووچییی و نامەنتیقێتی ئەوجۆرە قسەو هەڵوێستانە تۆختریش دەبێتەوە، لەحاڵێکدا کە خاوەنەکانیان خۆیان پێ مسولمان بێ‌و، هەڵوێستێکی دژو نەیاریش لەمەسەلەیەك وەربگرن، کە دەقی قورئانو سوونەتی پێغەمبەر ﷺ هەڵیبڕیوەو یەکلایی کردۆتەوە، وەك مەسەلەی چەندژنیی!

ئاخر چۆن عەقڵ‌و مەنتیق ڕێ دەدەن، مەدالیای پێشکەوتنخوازیی‌و دڵسۆزیی بۆ ئافرەتانو چی‌و چی، بەیەخەی بابایەکدا هەڵبواسرێ هەرلەبەر ئەوەی دژی مەسەلەی چەند ژنییە!! ئایا ناگونجێ ئەوکەسە لەزۆر ڕووەوە، بابایەکی زۆر موخەننەت‌و بێ فەڕو بەزەڕبێ؟!

هەروەها بەپیچەوانەشەوە، ئایا ناگونجێ بابایەك کە بەرگریی لەچەندژنیی دەکات، مرۆڤێکی زۆر چاکەکارو دڵسۆزو پێشکەوتنخوازبێ؟!

کەواتە:

بەڕاستی ئەوانەی بەوجۆرە پێوەرانە خەڵکی کۆمەڵگاکەیان بەگشتی‌و بەتایبەت نووسەرو ڕووناکبیرو سیاسەتمەدارو پەرلەمانتارەکانی هەڵدەسەنگێنن، خۆیان گیرۆدەی زۆر حوکمی ستەمکارانەو سەیرو سەمەرە دەکەن!

## سێ: وەسفکردنی یاسای چەندژنیی بەشتێکی قێزەون‌و دەرهاوێشتەی کۆمەڵگا بەجێماوەکان :

**سەرەتا دەڵێم:**

یەکێك لە یاسا ڕوون‌و ئاشکرایەکانی ئیسلامە، کە گاڵتە پێکردن (إستهزاء)و بە کەم‌و سووك سەیرکردن (إهانة و تحقیر)ی هەرکام لەوشتانەی، کە لە ئیسلامدا بەرزو پیرۆزن، وەك: خوا سبحانه وتعالی و پێغەمبەر ﷺو قورئان‌و سوننەت‌و...هتد، بەکوفر دادەنرێن‌و، مرۆڤیان پێ لەبازنەی ئیسلام دەچێتەدەرێ،

وەك خـــوا عزّوجـــلّ فەرموویـــەتی: ﴿... قُلْ أَبِاللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ...﴿٦٦﴾ التوبة﴾، واتە: ئایا گاڵتە بەخواو ئایەتەكانیو پێغەمبەرەكەی دەكەن! پاساو مەهێننەوە، بێگومان پاش بڕوا هێنانتان كوفرتان كردوە...

كەواتە: بابایەك كە یاسای چەندژنیی، كە یەكێكە لەیاسا ڕوونەكانی شەریعەتو لەقورئانو سوننەتدا باسكراوە -وەك پێشتر باسمان كرد-، بەقێزەونو بێزاروو عادەتو نەریتی كۆمەڵگا بەجێماوەكان وەسف دەكات، مانای وایە بەچاوی سووكو كەم تەماشای ئەو ئایەتو فەرموودانەی كردوە، كە یاسای ناوبراویان گرتۆتەخۆ، هەروەها مانای وایە كە پێغەمبەری خوا ﷺو چوار جێنشینەكانیو سەرجەم ئەو هاوەڵو زاناو پێشەوایانە، كە چەند ژنێكیان هەبووە، بەوە تۆمەتبار دەكات، كە شتێكی قێزەونو خراپیان كردوە! ئاشكراشە كە بابای وا ئەگەر گریمان پێشتریش دەعوای ئیمانو ئیسلامی كردبێو لێی سەلمێنرابێ، بەو قسەو هەڵوێستو بۆچوونەی، فڕی بەسەر ئیمانو ئیسلامەوە نامێنێ، مەگەر دوایی لەو هەڵەیەی پەشێمان بێتەوەو دووبارە بێتەوە نێو بازنەی ئیسلام.

بەڵێ ئەگەر ئەو جۆرە كەسانە مسوڵمان بن، ئەوە حوكمیانە كە گوتمان، بەڵام ئەگەر نامسوڵمان بن، ئەوە بەشێوەیەكی دیكە لەگەڵیان دەدوێینو پێیان دەڵێین:

وەك لەڕابردوودا باسمان كرد: تاكە بەدیلی واقیعییو كردەیی چەندژنیی، بریتیە لە زیناو داوێن پیسیی، بەهەموو جۆرو شێوەكانییەوە، بە بەڵگەی واقیعی زیندووو بەرجەستەی هەموو ئەو كۆمەڵگاو وڵاتانە، كە بڕوایان بە چەندژنیی نیە، جا ئایا بە بۆچوونی ئێوە: زیناو داوێن پیسیی شتێكی پاكو بێ عەیبو جوانەو، نیشانەی پێشكەوتنو شارستانێتییە؟!

ئەو زیناو داوێن پیسییەی كە بەرهەمەكەی -وەك بەچاوی سەر لەڕۆژئاوادا دەیبینین- سوپایەك منداڵی زۆڵو، زۆربوونی ڕێژەی تەڵاقو، هەڵوەشانەوەی خێزانو، چەندان دەردو نەخۆشیی كوشندەو چارەسەر بۆ نەدۆزراوەی، وەك:

ئیدزو زوهریی‌و سەیلان‌و... هتدو ئابڕووی دنیاو دوارۆژچوون‌و، سەر بەفەتارەت چوونە؟! ئێوە ئەگەر ئەمە بەشتێکی پەسندو جوان‌و پاك دەزانن، پیرۆزی خۆتان‌و هاوبیرانتان بێ‌و، وادیارە بەهۆی میزاج تێکچوونەوە، وەك ئەو قالۆنچەیەتان لێهاتوە کە بەبۆنی عەترو گوڵاو گێژ دەبێ‌و، حەز بەبۆنی تەرس‌و ڕیخ دەکات، وەئێوە پەندی: (تەیری گوڵ عاشقی داری ژەقنەمووتە)تان بەسەردا دەچەسپێ!

## چوار: تۆمەتبارکردنی ئیسلامییەکان کە هەڵوێستیان بۆ پشتگیریی کردن لەیاسای چەندژنیی، هاندەرێکی حیزبیی‌و سیاسی هەیە، نەك ئایینی:

لە وەڵامی ئەم قسەیەشدا چەند ڕوونکردنەوەیەك بەپێویست دەزانم:

١- قسەکردن لەسەر نیازو مەبەستی خەڵکی‌و ئەو پاڵنەرانەی بەرەو کارو ئامانجەکانیان دەیانجووڵێنن، جگە لە تفەنگ بە تاریکییەوەنان‌و (رجماً بالغیْب) هیچ پێناسەیەکی دیکە هەڵناگرێ، چونکە بێجگە لەخوای پەروەردگار هیچکەس لەنهێنیی‌و شارراوەی نێودڵ‌و سینەی مرۆڤ -کە نیازو مەبەست بەشێکیەتی- ئاگادار نیە.

٢- ئیسلامییەکان وەك وەسیلەو هۆکار تەماشای حیزب‌و سیاسەت دەکەن‌و، ئامانجیان خزمەتکردنە بەدین‌و ژینیی خەڵك، بۆیە شتێکی نامەنتیقییە -پێش ناشەرعییبوون- کە وەسیلەو هۆکار ببێتە پاڵنەرو جووڵێنەر!

٣- ئایا بابایەکی ئیسلامیی‌و مسوڵمان، چی لە ئیسلامییبوون‌و مسوڵمانەتییەکەی دەمێنێتەوە، لە حاڵێکدا کە لە پارلەمان‌و هەر پێگەو شوێنێکی دیکەدا، بەرگری لەئایین‌و بەرنامەی خواو یاساو بڕیارەکانی نەکات؟!

٤- ئنجا ئەو جۆرە کەسانە حاڵیان لە دوو شتان بەدەر نیە:

یان بەرگری لێکردنی ئیسلام‌و یاساکانی بەباش دەزانن، یان بە خراپ!، جا ئەگەر بەباشی دەزانن، دەبا بفەرموون خۆشیان بەرگری لە ئیسلام بکەن‌و، نەهێڵن ئەو شتە باشە تەنیا هی ئیسلامییەکان بێ، وە ئەگەر بەخراپیشی

دەزانن كەواتە بۆچی قەڵسن كە ئیسلامییەكان خاوەنی پشكو بەشێكی خراپ بنو، بۆچی ئێرەیی‌یان پێدەبەن لەشتی خراپدا –بەگومانی ئەوان-؟!

٥- وەبێگومان شتێكی ئاساییو چاوەڕوانكراوە بۆ حیزبو سیاسەتێكی ئیسلامیی، كە لەسەر ئیسلام بكاتەوەو، بەرگری لە یاساكانی بكات، چونكە حیزبو ڕێكخراوێكی ئیسلامیی كارەكەی بریتیە لە بووژاندنەوەی ئیسلامو پڕاكتیزەكردنی حوكمو سیاسەتێكی ئیسلامییو، حوكمو سیاسەتی ئیسلامییش بێجگە لەیاساكانی ئیسلامو بەها بەرزەكانی شتێكی دیكە نیە.

## پێنج: تۆمەتباركردنی زانایانو وتاربێژەكان كە بۆچی لەسەردەمی ڕژێمی بەعس دا لەسەر یاسای باری كەسێتی وەدەنگ نەهاتوونو هەڵوێستیان نەبووە؟!

حەزدەكەم ئەم چەند ڕوونكردنەوەیەش لەبارەی ئەم قسەیەوە بنووسم:

١- دیارە مامۆستای مزگەوتەكانیش وەك هەموو چینو توێژەكان جۆراو جۆرنو، هی زۆرباشو هی باشو هی خراپیشیان لەنێودا هەنو، هەموویان ڕەوانیە یەك حوكمیان بەسەردا بكێشرێ، خوای زاناو شارەزا لەوبارەوە فەرموویەتی:
﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ ...﴿٣٢﴾ فاطر ﴾.

٢- زاناو مامۆستای زۆر بوێرو فیداكار لەسەردەمی ڕژێمدا هەبوون، كە قسەی هەقیان كردووەو، ڕەخنەیان لەڕژێم گرتووەو، بەرگرییان لە دینو ژینی كۆمەڵگایەكەیان كردووەو، هەبووە لەوپێناوەشدا شەهید بووە، یان دووچاری زیندانو كۆچو ئاوارەیی بووەو، بەشێكیشیان بەشداریی خەباتی ڕزگارییخوازییان كردوە.

٣- ئەوساو ئێستاش كەسانێكی بووەدەڵەو هەلپەرستو دوو ڕوو، لەبەرگو پۆشاكی مەلایەتی‌دا هەبوونو هەن، كە زیاتر وەك بابایەكی خاوەن پیشەو

كاســـبو خۆژیێن دێنــە بەرچـــاوو، كەسـێك زۆر بیٚویـژدان نـەبێ ئـەوجۆرە مەلایانە لەسەر ئیسلام حیساب ناكات.

٤- دیارە من لێرەدا بەڕەوای نازانم، پاساو بۆ هــەموو وشــەو بڕگــەو دەربڕینێكـی هەركام لەو مامۆستا وتاربێژانە بهێنمــەوە، كـە چ لەمەســەلەی یاسـای بـاری كەسێتیدا، چ لەهەر مەسەلەیەكی دیكەدا، بـەرگری لەشــەریعەتو یاسـاكانی دەكەن، چونكە بێگومان هیچكەس نیە بێ هەڵەو پەڵە بــێو، خۆشــم زۆرجـار سەرنجو تێبینیو ڕەخنەم لەبارەی وتــاری هــەینی زۆرێــك لــە وتاربێژەكانــەوە هەبووە، بــەڵام بێگومــان ئــەركی سەرشــانی مامۆســتایانی وتاربێژیــشە، كـە بەهەموو توانایانەوە بەرگری لەئیسلامو یاساو ڕاســتییەكانی بكــەن، ئەگــەرنا بێگومان هەم ئەو ناوەی، كە لێشیان نراوە (زانایــانی ئیــسلام)و (پێــشەوایانی مــسوڵمانان) لێیــان خەســار دەبــێو، هــەم ئــەو مووچــەیەش كــە لەبەرانبــەر جێبەجێكردنی ئــەركی مامۆســتایەتیو پێــشەوایەتیدا وەریدەگـــرن، پێیــان حەڕام دەبێ!

٥- شـــتێكی زۆر ئاســـاییو چــاوەڕوانكراوە كــە زانایــانی ئیــسلامو مامۆســـتا وتاربێــژەكان، لەســایەی ئــەم ئیــدارەو حكوومەتــە خۆماڵییــەماندا دەســتیان كراوەترو بواریان ڕەخساوتر بێ بۆ گوتنی ئەوەی بەهەقو ڕاستی دەزانن، چونكە ئەوە هەر مامۆستایان نین بەڵكو بەگشتی بواری ئازادیی بیروڕا بۆ هەموولایەك ڕەخساوە، بەڵام گــرنگ ئەوەیــە هەموولایــەك شــتی هــەقو ڕاســت بڵێیـــنو، بەشێوازێكی هەقو ڕاستیش بیڵێین.

لێرەشدا كۆتـایی بــەم خـاڵی نۆیەمــە دێــنینو بــەرەو خـاڵی دەیــەمو كۆتـایی دەگوازینەوە:

## ١٠- چەند قسەیەكی دڵسۆزانە لەگەڵ داكۆكیكەران لە مافی ئافرەت دا:

لە خاڵی دەیەمو كۆتایی ئەم بەشەی دووەمەدا كە تەرخانمان كردبوو بۆ توێژینەوەی مەسەلەی چەندژنیی، چەند قسەیەكی دڵسۆزانە ئاڕاستەی هەموو ئەوانە دەكەم، كە بەڕاستیی و دڵسۆزانە مەبەستیانە كێشەو گیرو گرفتەكانی ئافرەت لە كۆمەڵگاكەمان دا چارەسەر بكرێن:

**یەك: سروشتی كێشەو گرفتەكانی ئافرەتو خێزان لەهەركۆمەڵگایەكدا مۆرك (طابع)ی تایبەتی خۆی هەیە، بەگوێرەی ئەو ئایینو عەقیدەو كلتوورەی كە هەیەتی، بۆیە پێویستە زۆر وریا بینو لەئەنجامی لاسایی كردنەوەی كوێرانەدا —كە بەداخەوە خەڵكێكی زۆرمان گیرۆدەی بووە- كێشەو گرفتەكانی ئافرەتو خێزانی كۆمەڵگایەكی جیاواز لەهی خۆمان، تەبەننی نەكەینو بە بەلاش خۆمان مشەووەش بكەین! بەڵكو باواقیعبینانە كێشەو گرفتەكانی ئافرەتو خێزانی نێو كۆمەڵگای خۆمان ببینینو، هەوڵی چارەسەركردنیان بدەین.**

**دوو: هەركۆمەڵگایەك بیەوێ كێشەو گرفتەكانی خۆی لە هەر بوارێكدا چارەسەر بكات، عەقڵو مەنتیق دەخوازێ كە لەبەر ڕۆشنایی ئایینو كلتوورو بەهایەكان (قِـیَم)ی خۆیدا، كە قەناعەتی پێیانە، ئەو هەنگاوە بنێ، دیارە ئێمەش وەك كۆمەڵگایەكی مسوڵمان، پێویستە بەپشتبەستن بەئایینو بەرنامەكەمانو لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەت دا، هەوڵی چارەسەری سەرجەم كێشەو گرفتەكانمان بدەین، چ پەیوەندییان بەئافرەتو خێزانەوە هەبێ، چ بەهەرلایەنو بوارێكی دیكەی ژیانو گوزەرانەوە.**

دیارە كێشەو گرفتەكانی پەیوەست بەئافرەتو خێزانەوەی كۆمەڵگای ئێمەش —وەك پێشتریش گوتوومانە- كانگای سەرەكییان بریتییە لە لادان لە شەریعەتو پێوە پابەندنەبوونی، بۆ نموونە: باسەرنجی چەند گیروگرفتو نەخۆشییەكی كوشندەو تەشەنەكردووی كۆمەڵگاكەمان بدەین، كە بوونەتە

بەڵاو کابووسێکی گەورە بۆ ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتانو خێزانەکانیشیانو، هەمووشیان بەهۆی لادان لە شەریعەتەوە پەیدابوون:

١- کوشتنی ئافرەت بەتۆمەتی زینا، بەبێ بەڵگەو ئیسپاتی شەرعیی.

٢- خۆکوشتنی ئافرەتان.

٣- زیناو داوێن پیسیی.

٤- ئیستغلالکرانی ژمارەیەك لە ئافرەتانی دوور لە پەروەردەی ئیسلامیی، لەلایەن بەرپرسانێکی بێ دینو ڕەوشت نزمەوە.

٥- بە کەم سەیرکرانی ئافرەت، لە بوارەکانی سیاسیو کۆمەڵایەتیدا.

٦- بەکارهێنانی وێنەو دیمەنی مێینایەتی تێدا بەجەستەکراوی ئافرەتان، لەلایەن زۆرێك لەڕۆژنامەو گۆڤارو کلیپچیو گۆرانی بێژەوە، بەمەبەستی وروژاندنو دەوری خۆ قەرەباڵغ کردنو زۆرکردنی خوێنەرو تەماشاچی!

٧- ڕەواج پێدانی بەرگو پۆشاکی وروژێنەرو مێینایەتی بەرجەستەکەرو، هاندانی ئافرەتان بۆ لاسایی کردنەوەی مۆدێلی سەیرو سەمەرەی جلو بەرگ، کە بێگومان ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە لەبیانوو بەدەستەوەدانی ئەو جۆرە ئافرەتانە، کە پیاوانی خۆیان ئاسا تەماعیان تێبکەنو...هتد.

**سێ: پێویستە کێشەو گرفتەکانی ئافرەتانی -یان بەشێك لە ئافرەتانی- کۆمەڵگاکەمان هەموویان ببینینو پاشان پلەپلە ڕیزبەندیی (ترتیب)یان بۆ بکەینو، بەپێی یاسای لە گرنگترەوە بۆگرنگ چوون (الأهم فالمهم) چارەسەریان بکەینو کامیان لە پێشترەو چارەسەرکردنی سوودی زیاتری تێدایە بۆ ئافرەتو پیاوو خێزانو کۆمەڵگاش، وە زیانی گەورەتریان لێ دوور دەخاتەوە، پێشی بخەین.**

جا بێگومان ئەگەر بەپێی ئەو بنەمایە کاربکەین، ئەوکاتە دەزانین کە ئەگەر گریمان مەسەلەی چەندژنیی بەگرفتیش دابنرێ —کە لەڕاستییدا وانیەو

بگرە چارەسەری گیرو گرفتی زۆركەسیش دەكات- ئەوە بێگومان چەندان قەیرانو گیروگرفتی زل زل هەن، كە پشوویان بەژمارەیەكی زۆر لەئافرەتان سواركردوەو بوونەتە دیاردەی زەقو بەرچاویش، لەحاڵێكدا كەمەسەلەی چەندژنیی بۆتەوە حاڵەتێكی كەمو دەگمەن!

جا لێرەدا بۆمان هەیە بپرسین: ئایا شتێكی سەیرو نامەنتیقی نیە، كە مەسەلەی چەندژنیی كە حوكمو بڕیارێكی شەرعییو ڕەوایەو، چارەسەری گرفتو كێشەی گەلێك پیاوو ئافرەتی تێدایە، ئەو هەموو هەڵلایەی لەسەر سازبكرێ، بەلام مەسەلەی زیناو داوێن پیسی، كە ئێستا بۆتە دیاردەیەكی زەقو سەرنجڕاكێشو هەڕەشەیەكی گەورەو جددییە لەسەر ژمارەیەكی زۆر لە خەڵكی كۆمەڵگاكەمان، بێدەنگەو دیزە بەدەرخۆنەی لێبكرێو، وەك شتێكی ئاسایی سەیربكرێ؟ وە ئایا ئەو جۆرە هەڵوێستە، سەدو یەك نیشانەی پرسیار لە دڵو مێشكی مسوڵمانانی ڕەوشت بەرزو داوێنپاكدا لەسەر بانگەشەكەرانی دژایەتی چەندژنیی دروست ناكات؟!

**چوار: لەكاتی بەرگری كردن لە ئافرەتانو مافەكانیاندا، پێویستە سەرجەم چینو توێژەكانیان بێنینەبەر چاومانو هیچكەس تەنیا لە هەمبانەی خۆیدا گوێز نەژمێرێ.**

جا لێرەدا بەچاكی دەزانم ئاماژە بە قسەی ئافرەتێك بكەم، كە بەرپرسی بڵاوكراوەیەكی ئافرەتانەو پاش شووكردنی بەپیاوێكی خاوەن ژنو ماڵو ڕەخنە لێگیرانی لەلایەن ئافرەتێكەوە كە دانیشتووی یەكێك لە وڵاتانی ڕۆژئاوایە، كە بۆچی سەربەهەوێ چووە؟! لە وەڵامی‌داو لە هەفتەنامەی (میدیا)دا گوتبووی: ئەگەر تۆ لەدەرەوەیو گرفتت نیە چی دەكەی، ئەوە من لێرە گرفتم هەیەو بۆیە هەقی گلەیی كردنت لێم نیە! پێشینانیش جوانیان گوتوە: (ئەوەی نیە لەماڵم ئاگای نیە لەحاڵم!)، بۆیە بەڕاستی هەركەسێك بەڕاستی دڵسۆزی ئافرەتانی كۆمەڵگایەكەی بێو، واقعبینانەو گشتگیرانە تەماشای دنیا بكات، لەجیاتی

گلەیی‌و گازندە، دەبێ دەست خۆشیی لەو ئافرەتانە بکات، کە بە شێوەیەکی پاك‌و حەڵاڵ‌و شەرعییانە لەگەڵ پیاوێکی خاوەن ژن‌و ماڵدا دەبنە هاوسەر، وە لەجیاتی ئەوان گلەیی لەو ئافرەتانە بکات، کە چاویان لە شتی پیس‌و حەرامەو سەرەنجام منداڵی زۆڵ‌و دەردو نەخۆشیی کوشندە بەنێو کۆمەڵگادا بڵاودەکەنەوەو، خۆشیان‌و کەس‌و کارو بنەماڵەشیان دووچاری شەرمەزاریی دەکەن‌و زۆر جاریش سەری خۆیان بەفەتارەت دەدەن‌و، سزاو جەزرەبەو شەرمەزاریی قیامەتیش –بۆ کەسێك بڕوای هەبێ- لە هەمووی قورستر!

ئایا شتێکی سەیرو نامەنتقی نیە، کە لەسەر شتی شەرعیی‌و پاك گلەیی بکرێ، کەچی لە بەرانبەر شتی پیس‌و حەرامدا بێدەنگی بکرێ‌و بەشتێکی ئاسایی سەیر بکرێ؟! وە ئایا ئەو جۆرە کەسانە ئەم ئایەتە قورئانییەیان بەسەردا ناچەسپێ‌و پڕبەپێستیان نیە، کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمُنكَرِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمَعۡرُوفِ ...﴿٦٧﴾ التوبة﴾، واتە: پیاوانی دەغەڵ‌و دووڕوو وئافرەتانی دەغەڵ‌و دووڕوو هەندێکیان لە هەندێکیانن، فەرمان بەخراپە دەکەن‌و ڕێگریی لە چاکە دەکەن؟!.

**پێنج: شتێکی ئاشکرایە کە سەرجەم ئەوانەی ڕەخنە لە یاسای چەندژنیی‌و یاساکانی دیکەی شەریعەت دەگرن، لەژێر کاریگەریی فیکرو سیاسەت‌و عادەت‌و نەریتی وڵاتانی ڕۆژئاوادان.**

جا بۆئەوەی بەکورتی‌و پوختی هەموو لایەك بزانین، کە لاساکردنەوەو تەسلیم بوونمان بۆ ڕۆژئاوا، بەتایبەت لە بواری ئافرەت‌و خێزاندا، تووشی چ چارەنووسێکی تاڵ‌و دژوارمان دەکات، یەك یاسا (قانون)ی وڵاتانی ڕۆژئاوا لە بواری باری کەسێتیدا بە نموونە دێنینەوەو ڕووداوێکی واقیعیشی لەسەر دەگێڕینەوە، شایانی باسیشە ئێمە نموونەکە لە یاسای ئەڵمانی دێنینەوە، کە

وێنەیەکی یاساکانی وڵاتانی ڕۆژئاوایەو یاساکانی باری کەسێتی وڵاتانی ڕۆژئاوا، لەو بارەوە زۆر لەیەك نزیکن، ئەگەر کتومت وەك یەکیش نەبن:

یاساناسو پسپۆڕی بواری یاسای باری کەسێتی ئەڵمانی (herbert grziwotz) دەڵێ[1]: (لە یاسای ئەڵمانییدا مێرد بۆی نیە داوای قەرەبوو کردنەوە (تعویض) لە ژنەکەی بکات لەکاتێكدا دۆست (عشق)ێك دەگرێ، بەهۆی ئەوەوە کە هەستی بریندار کردوەو کەرامەتی شکاندوە، بەڵکو ئەوپەڕی دەتوانێ لەکاتی ئاوس بوونی ژنەکەیدا لە دۆستەکەی، داوای بژاردنەوەی خەرجییو مەسرەفی منداڵبوونەکەی بکاتەوە)!!

بڕوانە: (پرسیار گەلێکی یاسایی گرنگ لەبارەی هاوسەرگیرییەوە)، لاپەڕە (٣٠ - ٣١.

ڕووداوێکی واقیعی بۆ چۆنیەتی جێبەجێکردنی یاسای نابراو:

خاوەنی کتێبی (أحکام الأحوال الشخصیة للمسلمین في الغرب) پاش باسکردنی یاسای ناوبراو لە دەمی یاساناس (هربرت غرتسیفوتس-herbert grziwotz)ەوە ئەم بەسەرهاتە دەگێڕتەوە[2]:

(گەنجێکی ئەڵمانی کە پێشتر کافر بوو، مسوڵمان بووبوو، پەیوەندی پێوە کردمو هەواڵی دامێ کە ژنەکەی دۆستێکی گرتوەو هێناویەتە ماڵەوە لەبەرچاوی منداڵەکانیان، جا کاتێك دۆستەکەی لە نێو ماڵدا ویستوویەتی بچێتەلای، مێردەکەی تووڕە بووەو لەگەڵ دۆستی ژنەکەی لێکیان داوە.

ئنجا کاتێك پۆلیس هاتوەو مێردەکە هەواڵەکەی بۆ گێڕاونەوەو هۆی بەشەڕهاتنەکەی بۆ ڕوون کردونەتەوەو، داوای کردوە کە دۆست (عشق)ەکە لە

١) بڕوانە: (أحکام الأحوال الشخصیة للمسلمین في الغرب) د. سالم بن عبدالغني الرافعي، ص (٤٩٦-٤٩٧).

٢) سەرچاوەی پێشوو، ص٤٩٧.

ماڵەکەی دەربکەن!، پۆلیس پێی گوتوە: ناتوانین هیچت بۆ بکەین، چونکە ئەم کابرایە میوانی ژنەکەتەو ناتوانین دەری بکەین!

ئیدی سەرنجام پۆلیس ڕۆیشوەو دۆستی ژنەکەش لەگەڵی چۆتە ژووریّو مێردەکەش سەراسیمە بووەو نەیزانیوە چی بکا!

ناتوانیّ لە ژنەکەی بدات، چونکە بەپێی یاسا ئەوە دەستدرێژییە بۆ سەر مرۆڤایەتی ژنەکەی!

هەروەها ناشتوانیّ پێشگیریی لیّ بکات، کە لەگەڵ دۆستەکەی ڕابوێریّ، چونکە بەپێی یاسا ئەو مەسەلەیە ئازادی کەسێتی‌یە!

دیسان ناشتوانیّ لە دۆستی ژنەکەی بداتو دەریبکات، چونکە میوانی ژنەکەیەتی!!

کەواتـــە:

یان دەبیّ ماڵەکەی بەجیّ بهێڵیّو داوای جیابوونەوە بکات، یان بە سەرشۆڕیی لە ماڵەکەیدا بمێنێتەوە!!).

شایانی باسیشە کە ژن لێرەدا چ مافێکی هەیە، مێردیش هەمان مافی هەیە، واتە: ئەویش بۆی هەیە دۆستەکەی، یان دۆستەکانی خۆی بێنێتەوە ماڵیّو ژنەکەیشی تێیەوە ڕامێنیّو زەقەی چاوی بیّ!

بەڵیّ بەڕێـــزان!

ئا ئەم یاسایەو هاوێنەکانی یاساکانی باری کەسێتی وڵاتانی ڕۆژئاوا پێکدێنن، جا ئایا کەسانێك کە هەوڵی لابردنو گۆڕینی یاساکانی شەریعەت دەدەن، چ لە بواری باری کەسێتیو چ لەهەر بوارێکی دیکەدا، بەیاساکانی وڵاتانی ڕۆژئاوا، وەك ئەوکەسە نین کە کانیاوێکی شیرینو زوڵاڵی لەبەر دەستە، کەچی لە ئاوو چڵپاوی زەلکاوێك دەخواتەوە؟!

لە کۆتایی ئەم خاڵی دەیەمەو سەرجەم ئەم توێژینەوەیەشدا دەڵێم:

١- خۆزگە وەك چۆن ئێمەی مسوڵمان بەڕوونو ڕاشکاویی قەناعەتو بڕوای خۆمان لەبارەی مەسەلەکانەوە ڕادەگەیەنین، ئەوکەسانەش کە بڕوایان بەئیسلامو شەریعەتەکەیو یاساو بڕیارەکانی نیە، بوێریی ئەوەیان ببووایە کە قەناعەتو بڕوای خۆیان بە ئاشکراو بێ پێچو پەنا خستبایە ڕوو و چیدی بەمەبەستی چەواشەکردنی خەڵك، خۆیان لەبن پەردەی مسوڵمانەتییدا حەشار نەدابایەو، وازیان لەو دووانەتیی (إزدواجية)و نیفاقە هێنابایە!

٢- وەخۆزگە ئەوکەسانەی کە بەناوی سەرجەم ئافرەتانی کۆمەڵگایەکەمانەوە دژایەتی یاسای چەندژنییو یاساکانی دیکەی شەریعەت دەکەن، چ لەبواری باری کەسێتیداو چ لەهەر بوارێکی دیکەدا، دەیانزانی کە وەك خەیاڵ دەکەن زۆرینە نینو نوێنەرو وەکیلی ئافرەتانیش نین، بەڵکو کەمینەیەکی پف لەخۆ کردووی دەنگ بەرزکەرەوەن، بەحوکمی ئەو بارودۆخە نائاساییو ناسروشتییو پڕستەمو گەندەڵییەی کە لەم ڕۆژانەدا بۆیان ڕەخساوە!

ئیدی بەهیوای ئەوە، کە هەموولایەکمان بەهۆی چاکتر تێگەیشتنی شەریعەتی خوای کاربەجێو یاساو بڕیارەکانیو پێوەپابەندبوونیانەوە، بتوانین سەرجەم کێشەو گیروگرفتەکانمان لە هەموو بوارو لایەنەکانی ژیانو گوزەرەانی تاکییو خێزانییو کۆمەڵایەتییماندا، چارەسەر بکەینو بەختەوەریی ئەم دنیاو سەرفرازیی ئەولاش بۆخۆمان دەستەبەرو مسۆگەر بکەین.

سبحان ربك رب العِزَّة عمّا يصفون، وسلام على المرسلين، والحمدلِلّهِ رب العالمين

١ ذي الحجة ١٤٢٩

٢٩ کانوونی یەکەم ٢٠٠٨

هەولێر

# بەرهەمەکانی دانەر

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی ٢/ ٢٠٠٦.
٢- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلامو ڕێچكان. چاپی ٣/ ٢٠٠٦
٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤـ دا. چاپی ١ /١٩٨٧
٤- کۆمەڵـی خوا. چاپی ١ / ١٩٨٨
٥- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟چاپی٣ /٢٠٠١
٦- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامی. چاپی ١ /١٩٨٩
٧- ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ کامەیە؟! چاپی ١/ ١٩٨٩

تێبینی: ((دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ : بەشی یەکەم: بیروبڕوای مسوڵمان) وە دواتر ئەمیش خرایە نێو کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی))یەوە .

٨- ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون. چاپی ٣ /٢٠٠٥
٩- کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! چاپی ١ / ١٩٨٩
١٠- حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغووت. چاپ ٢ /٢٠٠٥
١١- سۆزی نەتەوایەتیو بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا. چاپی ٣ /٢٠٠٥ .
١٢- مسوڵمانی کامڵ/ بەشی یەکەم: بیروبڕوای مسوڵمان چاپی ١ /١٩٩٧

تێبینی: ((دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە)).

١٣- چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمانو پەرلەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٢
١٤- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مانو نەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٣
١٥- بزووتنەوەی ئیسلامییو ئایندەیەکی گەشو ڕوون. چاپی ١/ ١٩٩٥
١٦- پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٧- چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەكانی كوردستان. چاپی ١ /١٩٩٦

١٨- ئیسلامو كێشە هەنووكەییەكان چاپی ١ /١٩٩٥

١٩- با وریا بین! داڕووخانی ڕەوشت كۆمەڵگاكەمان بەرو هەڵدێر دەبات. چاپی ٢ /٢٠٠٦.

٢٠- مسوڵمانی كامڵ: بەشی دووەم/ خواپەرستی مسوڵمان – بەرگی یەكەم . چاپی ١ / ٢٠٠٠ .

٢١- مسوڵمانی كامڵ: بەشی دووەم/ خواپەرستی مسوڵمان – بەرگی دووەم . چاپی ١ / ٢٠٠٠ .

تێبینی: ئەم كتێبە بە هەردووك بەرگەكەیەوە ئێستاكە لەژێر چاپە بۆ جاری دووەم لە چوار بەرگدا بەناوونیشانی: خواپەرستیی ئیسلامیی .

٢٢- گەڕانەوە لای خوا (عزّ وجلّ) . چاپی ٤ /٢٠٠٥

٢٣- زانایانی ئیسلامو كێنو چۆنن ؟! چاپی ٢ / ٢٠٠٢

تێبینی : بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢٤- بنچینە گرنگەكانی هەڵسوكەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەكان دا چاپی ١ / ١٩٩٩ .

تێبینی: ئەم نامیلكەیە باسێكی بەرگی یەكەمی كتێبی: (خواپەرستی ئیسلامیی)یە، وە بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە، بەڵام جارێ چاپ نەكراوە.

٢٥- مزگەوتەكانی كوردستان لە نێوان ئاوەدان كردنەوەو وێران كردن دا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٦- تاقیكردنەوەی خوا بۆ بەندەكانی چییەو چۆنە؟ چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٧- بنەما شەرعییەكانو هێڵە گشتیەكانی كۆمەڵێكی ئیسلامیی ڕەسەن .

تێبینی: (ئەم نامیلكەیە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی)

٢٨- كۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانجو هەڵوێستەكانی. چاپی ١ /٢٠٠١

٢٩- پاساوو بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵیی ئیسلامیی، ئاڵقەکانی: ١و ٢ و ٣ و ٤ . چاپی ١ / ٢٠٠١

٣٠- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانیو ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /٢٠٠٠.

٣١- ئافرەتو خێزان لە سایەی شەریعەت دا . چاپی ٢ / ٢٠٠٥

٣٢- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم . چاپی ٥ / ٢٠٠٥

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٣- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشكو برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٤- سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆر حسین محمد عزیز) . چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣٥- چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٦- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٧- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنجو ئاگادارییەك. چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٨- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٩- جیهاد لەڕێی خوادا چییەو بۆچی دەکرێو چۆن دەکرێ؟ چاپی١/ ٢٠٠٢

٤٠- ئەشکەنجەو زیندان (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر) چاپی ٢ / ٢٠٠٦ .

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٤١- کارو پرۆژەی ئیسلامیمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی ٢ / ٢٠٠٦ .

٤٢- ئیسلامو مسوڵمانەتیو کاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٤٣- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/١، ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی چییەو چۆنە؟! ١ تا ١٢ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٤- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٢، خوا بە یەکگرتن (التوحید) لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتی دا. ١٣ تا ٢٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٦

٤٥- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٣، خوا بەیەکگرتن لە ناوو سیفەتو لە پەرستراوێتی دا، ٢٧ تا ٣٦ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٦- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٤، ئیمان بە فریشتەکانی خوا (عزّوجل)، کتێبەکانی خوا (عزّوجل)، پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام). ٣٧ تا ٤٠ . چاپی ١ / ٢٠٠٧

٤٧- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ ٥، ئیمان بە ڕۆژی دوایی قەزاو قەدەر ٤١ تا ٤٥ . چاپی ١ / ٢٠٠٨

٤٨- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/٦، تایبەتمەندیی و دیدو بۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست. ٤٦ تا ٥٠ . چاپی ١ / ٢٠٠٨

٤٩- تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان. چاپی ١/ ٢٠٠٧

<u>تێبینی</u>: زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاوولاتی)و ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بلاوکراوەتەوە.

٥٠- گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا.

٥١- بە دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟

٥٢- سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك.

٥٣- چۆنیەتی بوونە پێشەنگو بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی.

٥٤- چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی.

٥٥- قوتابیانی زانیاری شەرعی چەند سەرنجو ڕێنمایی یەك.

٥٦- خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی یە.

٥٧- بانگەواز بۆ لای خوا .

٥٨- قوتابیان لەم هەڵو مەرجەدا پێویستە چۆن بن‌و چی بكەن؟!
٥٩- ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية).
٦٠- حوار خاص (مقابلة مع قناة العالم).
٦١- خواناسیی، ئایین ، ئیمان. چاپی ٢ / ٢٠٠٩ .
٦٢- واقیعی هەرێمی كوردستان ... دیدێكی ئیسلامییانە. چاپی ١/ ٢٠٠٨ .
٦٣- ئەم كتێبە (چەند بابەتێكی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەت دا. چاپی ١ / ٢٠٠٨ .
٦٤- چۆن باشتر لە كتێبی بەڕێزی خوا بەهرەمەند دەبین؟! چاپی ١/ ٢٠٠٨ .

## ئەو بەرهەمانەی لەژێر چاپن

١- پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ .
٢- الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تبارك وتعالى، المجلد الأول.

## ئەو بەرهەمانەی چاوەڕێی چاپن.

١- الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تبارك وتعالى، المجلد ٢- ٧ .
٢- خوو و ڕەوشتی ئیسلامیی.
٣- ئافرەت‌و خێزان لە سایەی شەریعەت دا. بەرگی دووەم.
٤- گرنگی‌و پێویستی پابەندیی بە قورئان‌و سوننەتەوە.
٥- چەند دەرسێك لە: (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)، كە ئەگەر خوا تەمەن بدات هەموو قورئان تەواو دەكەین.